# پزیشكی میللی لە نێوان كەلتوورو ئەتنۆلۆجیدا

## پێشەكی:

پراكتیكە زانستیەكانی مرۆڤناسی لە بواری پزیشكیدا لە سەرەتای چلەكانی سەدەی ڕابردووەوە، ئەتنۆلۆجیای پزیشكی وەكو لقێك لە مرۆناسیی گشتی ناسرا، وایدەخواست كۆمەڵگە پەرە بەو زانیاریانە بدات كە لای خەڵك كەڵەكە بوونە، سەبارەت بە هۆكارەكانی نەخۆشی، باری ژیانو شێوازی خۆپاراستن لە نەخۆشی[1]، ئەویش لە میانەی توێژینەوەی سەرجەمگیری لە دیاردەی كۆمەڵایەتیو كەلتووری وابەستە بە نەخۆشیو ساخلەمیەوە[2].

لەم ساڵانەی دواییدا چالاكی تۆژەرەوەكان گۆڕێكی زیاتری بەخۆ دا، ئەو دەمەی مرۆناسەكان لەگەڵ پزیشكەكاندا سەبارەت بە پزیشكیی كۆمەڵگە لە دەمەتەقێدا بوونو لە لێكچەری خوێندنگە پزیشكیەكاندا بەشداربوون، بەڵكو لە كۆمەڵگە

دواکەوتووەکاندا لە بواری خزمەتگوزاری تەندروستی گشـــتیدا کاریـــان کـــردووە، لـــە دروســـتکردنی نەخۆشـخانەو چـالاکییە کۆمەڵایـەتیو ژیارییەکانـدا (flow of life)، لـە قاوشـەکاندا، توێژینـەوەیان ئـەنجام داوەو بەشـداری چـاوپێکەوتنی ئـەو نەخۆشـانەیان کردووە کە ئەچنە ژووری نەشتەرگەرییەوە ( Plastic Surgery)، پیـادەکردنی چارەسـەری دەروونـی لـەنێو کۆمەڵگە سادەو تەقلیدییەکاندا پاڵنەرێك بوو بۆ ئەو دامــەزراوە پزیشــکیو چارەســەر ســازانە، چــونکە چـاودێری زیـاترو هەوڵـدان لـە بـواری توێژینـەوەی سالانەی زانایانی مرۆناسیو کۆمەڵ، وەکو دەلالـەتێك بـۆ پەیوەنـدیی کـارای نێـوان کۆمەڵناسـیو بـواری پزیشـکی لـە بەرژەوەنـدی مرۆڤـدا بەردەوامییـەکی ڕاستەقینەی هەبوو[٣].

ئەنترۆپۆلۆجیای پزیشکی بریتییە لە توێژینـەوەی نەخۆشیو بیروباوەڕی پزیشکیو چارەسەری خۆماڵی لە ڕێڕەوی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا[٤]، لە هەمان کاتدا ئـەم زانسـتە پەیوەنـدی بـە فاکتـەرە کۆمەڵایـەتیو کەلتووریەکانـــەوە هەیـــەو بـــە تەندروســـتیو نەخۆشییەوە پابەندە[٥].

بەرفراوانتر بڵێین: ئەنترۆپۆلۆجیا یان مرۆناسی پزیشکی لە گەلێ بابەت ئەدوێ وەکو پەیوەندی نەریتە باوەکان، تووشبوون بە نەخۆشی، پەیوەندی پیشە بە نەخۆشییەوە، دابەشبوونی ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی نەخۆشییەکان لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە، پەیوەندی ئاستی ئابووری بە جۆری خۆراکەوە، کاریگەریی ڕۆشنبیری لە لێکدانەوەی نەخۆشییەکانو هەندێ بابەتی تر ئەکۆڵێتەوە(٦).

هەندێ لە مرۆناسەکان بەشێکی گەورەی تۆژینەوەکانیان بۆ شێوازە ساکارو سەرەتاییەکانی پزیشکی مرۆیی بە هەردوو لایەنی خۆپاراستنو چارەسەرکردنەوە، تەرخان کردووە. ئەو هەوڵانە ناوەڕۆکی ئەفسووناویو ئەو ڕێورەسمە پزیشکیانە ئەخەنە ڕوو، کە مرۆڤایەتی لە شێوەی کەلتووری تەقلیدیو شێوە کۆمەڵایەتییەکاندا پشتی پێبەستووە(٧). سەرەڕای گەڕان بە دوای تیۆرەکانی نەخۆشی کە کۆمەڵگەو کەلتوورە جیاوازەکان، لەگەڵ تۆژینەوە وابەستەکان بە کەلتوورو نەریتە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بە بەراورد لەگەڵ نەخۆشییە دەروونیو زەینیو جەستەییەکان، بە تایبەتی لە هەلومەرجی گۆڕانی خێرای کۆمەڵایەتیدا کاریان

پێکـردووە[٨]. مرۆناسـی لـە کاریگـەریی کۆمەڵگـەی مـەدەنیو گەشـەکردنو تازەگـەری لەسـەر واقعـی تەندروسـتیی گـەلانو کۆمەڵـە هەمـەجۆرەکان دەکۆڵێتەوە، بە تایبەتی ئـەو گۆڕانکارییانـەی بەسـەر کۆمەڵو کۆمەڵگەی تەقلیدیدا هاتوون.

ئـەم زانسـتە تـەنها بـە پێشکەوتنە پیشەسازیو تەکنیکییەکانەوە، لە بوارەکانی پیشەی دەستیو کاری کشـتوکاڵییەوە ناوەسـتێ، بـەڵکو هـەموو ئـەو دەردو کێشەو کاریگەرییانـەش ئەگرێتـەخۆ کە پێویستییان بـە دەسـتی هاریکـاری، خزمـە تگـوزاری پزیشـکی، تەندروسـتی، خۆپاراسـتنو چارەسـەرکردنی نەخۆشـییەکان بـە شـێوەیەکی گشـتیو نەخۆشـییە دەروونـیو زەینییـەکان بـە تایبـەتی هەیـە. گرنگیـی ڕۆڵی مرۆناسـەکان لـە چالاکییەکانیاندا لـەو دیدەوە سەرچـاوەی گرتـووە کـە زانایـان لـە ڕووی تیـۆریو پراکتیکـەوە، لـە توێژینـەوەی مرۆیـی (لـە ڕووی کۆمـەڵو ڕۆشـنبیریو دەروونییـەوە) پشـتیان پێبەسـتووە، کـاتێ باسـی تەندروسـتی ئەکـەن مەبەسـتیان لایەنـە ئۆرگـانیو تێسـتە لابوورییـەکان نییـە، کـە پەیوەندییـەکی نزیکـی بـە پسـپۆڕی پزیشـکەکانی چارەسـەرکردنو ئـەو بایۆلۆژییانـەوە

هەیە کە لەگەڵ کێشە میکرۆبییەکاندا کارئەکەن، کـە ئەبێتــە هــۆی نەخۆشــی. بــەڵکو مرۆناســەکان هەوڵـەکانیان لەسـەر بـاری کۆمەڵایـەتی، کـەلتووری، دەروونـی، تەندروسـتیو نەخۆشـی چـڕکردۆتەوە، کـە پشت ئەستوورە بەو توخمو کردارو پەیوەندییانە کە لــە بــواری تەندروســتیدا بــۆ تۆژینــەوە ئەنترۆپۆلۆجییــەکان ئەشــێ، ئـەبێ ئـەوەش بڵـێین مرۆناســەکان زیـاتر کەسـانی پسـپۆڕی هۆشـیاریی کۆمەڵایەتین، ئەوان درك بـە پەیوەنـدی نێـوان دابو نەریتو چەمکە تەقلیدیو ئەو ژینگەیـە دەکـەن، کـە کاریگـەریی لەسـەر سـاخڵەمیو تەندروسـتی هەیـەو پەکی دەخات، واتە لە وردو درشـتی ئـەو کارتێکردنـە تەندروســتیانە دەکۆڵنــەوە، کــە لــە ئــەنجامی بەریەککــەوتنی ئـامێرە تەکنۆلۆژییــە نوێیــەکانو پاشــکۆکانی لەگــەڵ کۆمەڵــە بەشــەرییەکاندا سەریانهەڵداوەو دروستبوون..

## بەشی یەكەم

## مرۆناسیو ساخلەمی دەروونی

تەندروستی دەروونی، چەمكێكە بۆ باری ئەو كەسێتییەی كە ڕەنگە توانای وەرگرتنی ئەو هەڵوێستە كەلتووری، كۆمەڵایەتی یان دەروونیانەی هەبێ كە بەرەنگاری دەبێتەوە. هەر پەشێوییەك تووشی بێت بە هەڵچوونی دەروونیو ئەقڵی گوزارشتی لێدەكات، كە ڕەزامەندی خەڵكو دەوروبەری لە دەست دەدات.

ئەم پەشێوییە واتە نەخۆشی دەروونیو ئەقڵی ئەبێتە هۆی هەڵچوونی سەرتاسەری لە ڕەفتاری مرۆڤ كە لە باری هەڵچون، بیركردنەوە، ڕەفتاری كۆمەڵایەتی، وەزیفە فیزیكیو جەستەییەكانی لە یەك كاتدا كۆبوونەتەوە.

ئەگەر لایەنەكانی سۆزداریو ویژدانیی تووشی پەشێوی بوو، ئەوا بەو حاڵەتە دەڵێن هەڵچوونی دەمارگیری(٩)، وەكو حاڵەتی ڕاڕایی، هستریا، فۆبیاو دڵتەنگی ئەگەر سەرچاوەی پەشێوییەكە تێكچوونی باری فیكركردنەوە بوو ئەوا پێیدەڵێن نەخۆشی زەینی(١٠).

کە بە شێوەی جیاواز بە دیار دەکەوێ وەکو نەخۆشی شیزۆفرینیا، وڕێنەو پارانۆیا.

لادانە سایکۆپاتییەکان[١١]، کە گوناە و تاوانی لێدەکەویتەوە، بە هۆی پەشێوی ڕەوشتی کۆمەڵایەتییەوەیە. نەخۆشییە سایکۆماتییەکانیش[١٢] نیشانەن بۆ پەشێوی دەروونیو کاریگەریی لەسەر ئەرکە فیزیکیو جەستەییەکانی مرۆڤ هەیە. لەو نەخۆشییانەش، بەرزبوونەوەی فشاری خوێن، تەنگەنەفەسی Dyspnea و برینی گەدە، هەر جۆرێك لە جۆرەکانی پەشێوی، ئەوا وەزیفەکانی تریش تووشی پەشێوی دەکات، بۆ نموونە پەشێوی لە باری ڕاڕاییدا ئەوا کاریگەریی لەسەر لایەنە ویژدانیو جەستەییو ڕەوشتیو زەینییەکان دەبێ..

هەرچەند سەرچاوەی پەشێوییەکە ویژدان خۆیەتی، نەخۆشییە دەروونییەکان کۆبینێکن بۆ کێشە کەلتووریو کۆمەڵایەتیو زەینییەکانی تر، کە کۆمەڵگە پێشکەوتووە پیشەسازییەکانو کۆمەڵە تەقلیدییەکان وەکو یەك تووشی دەبن[١٣]. لە کاتێکدا ئەنترۆپۆلۆجییە دەروونناسەکان، جەخت لەسەر نەخۆشییە دەروونیەکان دەکەنەوە لەو کۆمەڵگایانەی تۆژینەوەیان لەسەر کراوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ

لەو پەشێوییانە بۆ نەخۆشییە سایکۆماتییەکان (Sychomathy) [١٤]، دەگێڕنەوە کە کەمتر لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا بەدەردەکەون.

پەشێوییە دەروونییەکان بە هۆی بەرکەوتەی فاکتەرە ژینگەیی و کەلتووری و فیزیکی و کۆمەڵایەتییەکانەوە، بە تاك یان بە کۆمەڵ ڕوودەدەن.

هەر لەم پێودانگە میتۆدییەوە، مرۆناسەکان لەو نەخۆشییە دەروونیانەی کە خۆیان بایەخیان پێدا، کۆڵینەوە ئەوانیش بابەتەکانی نەخۆشی و ساخلەمی بوون. کە لە توێژینەوە مرۆناسییەکاندا لێی دواین.

ئەوان لایەنە ئۆرگانی و فیزیکی و بەکتیرییەکانیان (کە جێی گرنگیدانی پسپۆڕەکانی ترە) مەبەست نییە، بەڵکو چاویان بڕیوەتە سەر ڕووە کۆمەڵایەتیەکەی و لایەنە کەلتورییە دەروونیەکەی نەخۆشی و ساخڵەمی وەکو تەندروستی دەروونی و پەشێوییە کەسێتییەکان. زۆر نەڕۆیشتووین ئەگەر بڵێین، مرۆناسەکان پسپۆڕی هۆشیاریی کۆمەڵایەتین بۆ وردەکارییەکانی کاریگەریی تەندروستی کە دەرهاویشتەی دیاردەی کارلێکی گرووپە بەشەرییەکانە، لەگەڵ تەکنۆلۆجیای

نوێداو لە کایەی پێشکەشکردنی هاریکاری خزمەتگوزاری پزیشکیو ساخلەمی –خۆپاراستنو چارەسەر- دایە، بە شێوەیەکی گشتی، و نەخۆشییە زەینیو دەروونیەکان بە شێوەیەکی تایبەتی.

ئەم پەیوەندییەی نێوان کەلتوورو کەسێتیو پەیوەندیی نێوان تەندروستیو نەخۆشییە دەروونیەکان بەرەو ڕووی تۆژینەوەی توخمەکانو ئەو فاکتەرانەی کە سەقامگیریی کەسێتی ئەخەنە بەرچاو، دەگرێنەوە، هەروەکو بووە هۆی لەدەستدانی سووربوونو ڕاستگۆیی، هەروەها مرۆناسەکان کەوتنە گەڕان بە دوای پەیوەندی نێوان کەلتوور، بە هەموو پێکهاتەو فاکتەرە ئۆرگانییەکانی لەگەڵ ئامادەگیو کارلێکی لەگەڵ توخمەکانی تریشدا. پەیوەندی هەریەك لەمانە بە نەخۆشی دەروونیەوە، هەرچۆن فاکتەری کەلتووریو ڕۆڵی ئەم فاکتەرە وەکو بابەتێکی بنەڕەتی لە لابردنو جێگیرکردنیدا بۆ بۆچوونو تۆژینەوەی زاناکانی ئەم بوارە، چاوی لێکرا.

## کەلتوورو نەخۆشیی دەروونی

زانا لینتۆن بۆ پێناسەی کەلتوور ئەڵێ: کولتور بریتییە لە تێکڕای گشتیی جۆرەکانی ڕەوشتی بەدەستهێنراوو ئاراستەو بەهاو ئەو پێودانگانەی کە تاکەکانی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو بەشداری تیا دەکەن‌و دەستاودەست دەیگوێزنەوە[١٥]. لێرەوە بەدیاردەکەوێ کە جۆرەکانی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی کە تاك فێری دەبێ لە چوارچێوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە وەریدەگرێ، لەبەر تیشکی کۆمەڵە بەهاو پێودانگێك ئەم جۆرە شێوازانە دیاریدەکرێن، کە شێوازی ژیانی کۆمەڵ ئاڕاستە دەکات.

گومانی تێدا نییە جۆری ئەو کەلتوورەی کە خاتوو (رۆث بندکن) جەختی لەسەر دەکات، کاردانەوەی کارتێکەری لەسەر پێکهاتەی سیمای کەسێتی هەیە، ئەو کەلتوورەی کەسێتی ئەشێوێنێ‌و جێلەقی دەکات‌و گۆڕانکاری لە ناواخنی کەسێتی، لە ئەنجامی تێکەڵبوونی مرۆڤ بە یەکترییەوە، دەکات، لە کاتی ڕاهاتنی لەگەڵ ئەو کەلتوورەی تێیدا دەژی.

کەسێتی وەکو سایکۆلۆژیای کلینیکی باسی لێوەدەکات هەرکاتێ تووشی پەشێوی یان ڕاڕایی دەبێ، نەخۆش دەکەوێو لەبەریەك هەڵدەوەشێ، لەبەر نەبوونی خۆگونجاندن لەگەڵ کەلتووردا، ئەمەش دەبێتە هۆی شێواندنی هاوسەنگی لەژێر قورسایی جۆرەکانی کەلتوور کە دەنگدانەوەی لەسەر کەسێتیو شوێنەوارو لەسەر جووڵە پێکهاتەی کەسێتی هەیەو دواتر لەسەر باری کۆمەڵایەتی فراوانتر کاریگەری دەبێ(١٦). کاریگەری کەلتوور لەسەر کەسێتی ئەوانەی ملکەچینو لەگەڵیدا کارلێك دەکەن، بەرەو ڕووی نەخۆشییە دەروونییەکانیان دەکاتەوە، لێکۆڵینەوەو تۆژینەوە مرۆناسییە دەروونییەکان پەردەیان لەسەر سرووشتو بەهاو دابونەرتیەکان لە خولقاندنی حاڵەتی گرژبوونو پەرکەمو ڕاڕایی دەروونی لەنێو تاكو کۆمەڵدا، بە شێوەیەك لە شێوەکان، هەڵدایەوە(١٧). هەروەکو پێشکەوتنە کەلتوورییەکانو پرۆسە هاوچەرخەکانو بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیاو زۆرانبازیی لەگەڵ دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان، بە تایبەتی کۆمەڵگەی تەقلیدی، لەگەڵ ئەو دەرەنجامانەی شارستانییەتی نوێ لە بوارە جیاجیاکاندا ڕەنێوی هێناوە، نەخۆشی دەخەنەوە.

هیچ گۆڕانکارییەك بەدی نایەت تاکو کاریگەری سلبی لەسەر ژیانی تاكو کۆمەڵ دانەنێت، وەکو نەگونجانو ناسەقامگیری لەگەڵ چالاکی ژیانی ڕۆژانەدا، لە بۆچوونو هەڵوێستەکان، کە جۆرێك لە گرژبوونو پەشێوی، لە ئەنجامی ناکۆکی لە ڕەفتاری ئاسایی خەڵك لە هەمبەر بارودۆخە نوێیەکان سەرهەڵدەدا. یان لە ئەنجامی دەرکەوتنی هەڵوێستو وەزعی نوێ کە تاکەکان یان کۆمەڵەکان ناتوانن شێوازی گونجاو بۆ بەرەنگاری ئەو وەزعە نوێیە بەدەستبێنن، بەدیدێ. تۆژینەوەکان بەڵگەن کە کاردانەوەی ئەو کەسانە بەرەو شێوەکانی کۆنەپارێزی دەیانگێڕێتەوە هەروەکو ڕەفتاریان بە شێوەیەکی نالۆجیکی دەبێو کەمتر پابەندی ملکەچبوون بە یاساو ڕێساکان دەبن، کاتێ مرۆڤ هەست بە ڕووخان دەکات، گرژبوونو هەڵچوونە دەروونییە کەڵەکەبووەکان، بۆ کاری شەڕەنگێزانە وەکو تووڕەو تۆسنی، کاری ئاشووبیو تێکدەرانە، پەلاماردان، جوێندانو بەکارهێنانی وشەی ناشیرین، ئاراستە دەکات. تاکەکان بە نەخشەدانان بۆ کاری دەستدرێژی کردنو توندوتیژی خەریك دەبن، لە دواییدا تووشی حاڵەتی داڕووخانی دەروونی[١٨] دەبێتو دەخرێتە

پەراوێزەوە Marqinal man تاك تووشی گرژبوونێك دەبێت كە نە ئەهوەن دەبێتەوە نە چارەسەر دەكرێ (ئەگەر رێگەی رزگاربوون لەو داڕووخانو نەگونجاوییە، نەدۆزێتەوە)، زۆرجار بە رێرەوی شەكەتبوونێكی بەردەوام (اعیاء مستمر)دا دەڕوات، خولیای سەرقاڵبوون بە تەندروستی خۆیەوە دەبێ، لەگەڵ رەوشتی مەزاجی خۆنەویستانە، تۆمەتكردن بە خەڵكەوە، لەو حاڵەتە گرژبوونە دەمارگیریو دەروونیانەوە، گۆڕانكاری لە كەلتوورو باری كۆمەڵایەتی، بەدی دەكرێ. ئەم گۆڕانكارییانەش وەكو كلاید كلاكهون[١٩]، باسی لێوە كات، دابونەریتە كۆمەڵایەتیو فاكتەرە كەلتوورییەكان وەكو یەك بەرپرسیارن بەرامبەری، بۆ نموونە دانیشتوانی مەلایۆ، خولیای پیاوكوشتن لە مێشكیاندایەو تینووی خوێنن[٢٠]. هەندێ لە هیندییەكانی كەنەدا وەكو مرۆڤ خۆرەكان هەڵئەسن بە پەلاماردانی مرۆڤ(٢١) Canni balism. هەندێ لە دانیشتوانی خوارووی رۆژهەڵاتی ئاسیا وا بیردەكەنەوە كە بوونەتە پڵنگ، هۆزەكانی سیبەریا خۆیان بە پاڵەوانی هستریای جەمسەری باكور دەزانن[٢٢]، دانیشتوانی (سۆمەترە) تووشی شێتی بەراز دەبن[٢٣].

هاوکێشــەی جیــاواز لــە کۆمەڵــە جیاوازەکانــدا ســەبارەت بــە تووشــبوون بــەم هەڵچــوونانە بــەدی دەکرێ، ئەمڕۆ لە ناو چینە باڵاکانـدا شـیزۆفرینیا[٢٤] بڵاوە، چینەکانی ناوەنـدیش لـە ئـەنجامی هـەژموونی چــــەپاندن[٢٥] تووشـــــی هەڵچـــوونە دەروونــــیو جەســتەییەکان Psychosomatic دەبــن. مرۆناســەکان تێبینییــان کــرد کــە کاریگــەری نەخۆشــی دەروونــی لەنێو دانیشتوانی ئەو کۆمەڵانـەی کـە گۆڕانکـاری بـە ویســتی پێشــینەی خــۆی کــردووە نــەك لــە ڕووی ناچارییەوە، زۆر کەمە، یان دەگمەنە.

هــەروەها نەخۆشــی بــرینی گــەدە لــەژێر بــاری ڕووخــان Frastration لــە نێویانــدا بڵاودەبێتــەوە. ژاپۆنییــەکان لـە دورگـەی هـاوای تووشـی هەڵچـوونی دەروونـی، وەکـو وروژانـی سـۆزداری لەوانـە خـەمۆکی دەبـن، بـەڵام ئـەم نەخۆشـییە تووشـی ئـەو ژاپۆنیانـە نابێـت کـە لـە وڵاتـی خۆیانـدا کـەلتووری ڕەسـەنی خۆیــان پیــادە دەکــەن، بــەڵکو ئــەم حاڵەتــە وەکــو کاردانەوەیەکی کەلتووری، یان کاریگەری کەلتوورێکی نـامۆ لـە سـەری شـتێکی سـەیر نییـە، چـونکە کـاتی گەڕانـەوەی ژاپۆنییەکـە لـە تاراوگـە بـۆ وڵاتـی خـۆی، ئەو لادانە دەروونیەی لە کۆڵ دەبێتەوە[٢٦].

کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەو کارتێکردنە دژوارەی کە کەلتوورو کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان لەسەر کەسێتی دایئەنێن، فاکتەرن بۆ ئەو نەخۆشیو وروژانە دەروونیەی کە کەسێتییەکان تووشی هەڵچوون دەکەن، لێرەدا جیاوازی نییە لە نێوان کەلتووری تەقلیدیو کەلتووری کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا، لە ڕووی ڕۆڵی تەندروستی دەروونیەوە، چونکە جیاوازی دیاردەی نەخۆشییەکان بە پێی هەڵوێستو تایبەتمەندییە کەلتووریو کۆمەڵایەتییەکان هەروەها سرووشتی توونـدڕەویو ئەو داڕووخانانەی کە مرۆڤ تووشی دەبێ جیاوازی هەیەو لە هەڵبەزو دابەزدایە، هەروەکو ڕۆڵی وەسیلەکانی ڕاهێنانو پەروەردەو ئاراستەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیو نەریتو بەها تەوەرییەکان کە ئەو کەلتووره پشت ئەستووره پێی، زۆر گرنگە.

تۆژەرەوەکان پێوەندیی نەخۆشییە دەروونییەکانو کەلتوور، بە زاراوەی ئەپیدمۆلۆجی کەلتووری[٢٧] Cultural Epidemology، ناودەبەن.

ئەوانەی لەم بوارەدا کاردەکەن وای دەبینن کە نەخۆشییە زەینیو دەروونیەکان بە پێی کەلتووری نەخۆشەکان جۆراوجۆرن، ڕەچاوی ئەوەیان کردووە

کە ئەم نەخۆشییانە لە کەلتووری کۆمەڵە تەقلیدیو ساکارەکان کە لێکۆڵینەوەیان ئەنجام داوە، جیاوازە لە کۆمەڵە پێشکەوتووە هاوچەرخەکان، بەو پێیەی ئەو نەخۆشییانەی کە ئەتنۆگرافەکان لە کۆمەڵگە سادەو تەقلیدییەکانیدا دۆزییانەوە هەرچەندە لای لێکۆڵەرە دەروونییە ڕۆژاواییەکان شتێکی نوێ بوو، وەکو نەخۆشی ئامۆك Amok و هێستیریای جەمسەری باکوری Arctic Hysteria و نەخۆشی ویندیگۆ Windigo، بەڵام ئاماژەیان بەوە دا کە ئەم نەخۆشیانەو هاوشێوەی ئەم نەخۆشیانە بە کۆمەڵێ نەخۆشی تازە دانانرێ، بەڵکو چەند حاڵەتێکی دەروونی تێپەڕ بووە، بەو کۆمەڵانەی ئەم نەخۆشیەیان تیا بڵاوبووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تایبەتمەندییە هاوبەشە لەگەڵ کۆمەڵە پیشەسازییەکانیشدا، بواری ئەپیدمۆلۆجی کەلتوری دوو ڕاستی گرنگی وروژاند ئەوانیش:

١-کۆمەڵگە کەلتووریە جیاوازەکان بە شێوەیەکی بەرچاو لە ڕووداوی (inciolence) نەخۆشییە جیاوازەکان بە گوێرەی دانیشتوانی هەریەکەیان لە قۆناغە زەمەنییە جۆراوجۆرەکاندا جیاوازی هەیە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە جیاوازییە کەلتووریەکان

ڕۆڵیــان لــە تێکــڕای تووشــبوون بــە نەخۆشــییە جیاوازەکان، هەیە.

٢-کۆمەڵگـەکانیش ڕێـژەی تووشـبوونیان بـە پێـی کۆی دانیشتونەکەی، جیاوازییان هەیـە، ئەمـەش ئـەو ڕایە بەهێز دەکات کە کەرەستەکانی چارەسەرکردن هەرچیەك بێت ئەوا جیاوازی ژینگە کەلتوورییـەکان لەســەر پلــەی بڵاوبوونــەوەی نەخۆشــی Prevalence کاریگەری هەیە. سروشتی ئەم پەیوەندییـە، کاتێ بـۆ کـەلتووری کۆمەڵگەیـەك ئـەڕوانی ڕوونـتر ئەبێتـەوە، بەو سـیفەتەی فاکتەرێکە لـە کەسـێتی ئەندامەکانـدا جێکاری سلبی هەیە. لەبـەر ئـەو ڕۆشـناییەش ڕەنگە لــەو گۆشــە نیگایــەوە کــارتێکردنی نەخۆشــی بــۆ کەلتوور بەم جۆرە پوخت بکەینەوە:

١-کـەلتوور، وەکـو گـرەنتی نەخۆشـی: نەخۆشـییە دەروونییــەکان بەرجەســتەی ئــەو فشــارانەن کــە دەزگاکان لەسەر تاك پێڕەوی دەکەن هەر لـە قۆنـاغی منداڵیــەوە، ئــەویش بــە هــۆی بێبەشــکردنی لــە ســۆزمەندی، لــە ئەنجامــدا پرۆســەی ڕازیکردنــی پاڵنەرەکانی لەو قۆناغەدا تووشی شکستێکی جوزئی دەبێت.

٢-گۆشـەی ماناکـان بـۆ تێگەیشـتن لـە نەخۆشـی: کێشـەی نەخۆشـی کێشـەی پێناسـەیە Definition یـان دیاریکردنی ئەو کێشەیە بـە پێـی ئـەو مانایانـەی کـە لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە لای نەتـەوەو کۆمەڵـەکان لەسەری کۆکن.

٣-گۆشەی گۆڕانکاری هاوچەرخ و کۆمەڵایەتی: ئەم پرۆسـەیە لـەو هاوچـەرخبوونەدا وەبـەردێ کـە کۆمەڵـەکان لـە ڕێگـەی داگیرکـاری کەلتوورییـەوە لـە لایـەن سیسـتەمە بەهاییـە ڕۆژئاواییەکانـەوە، تووشـی دێـن و بـەرەنجامێکی دەروونـی زیانبەخشـی لێدەکەوێتەوە.

٤-گۆشەی بەریەککەوتنی ڕۆڵەکان Role- Conflict: لەم گۆشـەیەدا تاکـەکان بـە پێـی ڕێکخسـتنی بـەهاکان نـەگونجاون، سـایکۆلۆژی کلینیکـی بـە فاکتـەرە کـەلتووری و هـەموو فاکتـەرە دەرەکییـەکان، کـە بـەرەنجامی هەلومـەرجێکی کۆمەڵایەتییـە، دەڵـێ نەخۆشـی وەزیفـی، یـان فاکتـەری وەزیفـی و هەنـدێ تۆژەری تر بـە فاکتـەری کۆمەڵایـەتی یـان کـەلتووری ناودێری دەکەن.

## لێكدانەوەی فیزیكی

## بۆ نەخۆشی دەروونی

لێكدانـەوەی فیزیكـی بـۆ نەخۆشـی دەروونـی، بـە كـۆی فاكتـەرە ڕەمـەكیو نەخۆشـییە فیزیكـیو ئـەو پێكهاتانە دەوترێت كە ڕۆڵێكی زیندووی لـە ڕوودانـی پەشێویو نەخۆشییە دەروونییەكاندا هەیە، لە لایەن كلینیكی سایكۆلۆژییەوە بە هەموویان دەڵێن هۆكارە زیندەگییەكان. ئـەتوانین بـەم جـۆرە بـە درێـژی لێـی بدوێین[٢٨]:

١-فاكتـەرە بۆماوەییـەكان Hereolitary: خەسـڵەتە مرۆییـەكان، لـە پێكهاتـە تایبەتییـەكانی بۆمـاوە، بەرهـەم هـاتووە، جگـە لـە كاریگـەریی هێزەكـانی دەوروبـەر. خەسـڵەتی بۆمـاوە كـاتێ بـە گشـتی پشـت ئەستوورە تـەنها بـە جینـەكانی بۆمـاوە وەكو ڕەنگـی چاوەكانو درێژیو ڕەنگی پێست ئـەوا بـە خەسـڵەتی بۆ ماوەی پەتیی یان یـەك خەسـڵەت دائـەنرێ. بـەڵام ئەگەر خەسڵەتەكە لە ئەنجامی چەند جینێكەوە بوو و دەوروبـەریش هـاتبووە سـەری، ئـەوا خەسـڵەتەكە خەسـڵەتێكی بۆمـاوەیی ڕووت نییـە، بـەڵكو

خەسڵەتێکی زگماکییە Congenital کاتێ فاکتەرە دیاریکراوەکان لەناو منداڵدانەوە گۆڕانکاری لە هێزە بۆماوەییەکە دەکاو خەسڵەتی تێکەڵ لە بۆماوەو دەوروبەر وەبەردێنێ.

لە تۆژینەوە نوێیەکاندا شێوەو ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان، پەردە لەسەر چەند ڕاستیەکی نوێ هەڵئەداتەوە، سەبارەت بە ڕۆڵی بۆماوە لە پەشێوییە دەروونیو زەینیو رەوشتە مرۆییەکان بە گشتی. لێرەدا کرۆمۆسۆمی ڕەگەزی نێرینە (Y) لەوانەی کە شەڕەنگێزی سایکۆپاثین، کرۆمۆسۆمێکی زیادە (y)یان هەیە، بەڵام قەدو باڵاو زیرەکییان سروشتییە. بەڵام زۆرێك لە نەخۆشە زەینییەکان لە نەخۆشخانە ئەقڵییەکان کرۆمۆسۆمێکی ڕەگەزی مێینە (X)ی زیاد لە ژمارەی سروشتی، چ لە نێرە، چ لە مێیە، لە خۆ دەگرێ. بوونی بەڵگەی بەهێز بۆ هۆکارە ڕەمەکییەکان وەکو نەخۆشییەکانی شیزۆفرینیا، خەمۆکیو پەستیو پەرکەم، مەرج نییە ئەم فاکتەرانە، نەخۆشیی بۆماوەی ڕووت بن، بەڵکو ئەوانەی هەڵگری ئەو جینانەن کە باسمان کردن، زیاتر ئامادەگییان تیایە بۆ نەخۆشی، ئەگەر هەلومەرجە کەلتووری کۆمەڵایەتی دەروونییەکە لەبار بێ.

ب-فاکتــەری پێکهــاتن Constitutional مەبەســتی کــۆی خەســڵەتە زینــدووەکانی تاکــە لــە ئــەنجامی کۆبوونــەوەی فاکتــەرە جیاوازەکــان وەکــو کرۆمۆســۆم، جینــەکانی بۆمــاوە، جــۆری ژینگــەو لــەش، سروشــتو سیستەمی هۆرمۆنی Termperment، بەرهەم هـاتووە. سیســتەمی هۆرمــۆنی کــە تــەوەری کەســێتییە، هــەر خۆشــی سروشــتی ســۆزداری لای مــرۆڤ لــە بەرامبــەر هەڵوێســتو دەوروبــەردا بڕیــاری لێئــەدا. بــۆ نموونــە ئەگــەر تــاك بەرامبــەر کارتێکردنــەکان زۆر هەســتیار بــوو، ئــەوا بەرامبــەر تەنگــژەکان تاقــەتی ئەچــێو هەندێ شێوەی پەشێویی دەروونی سەری تێدەکات.

بــەڵام سیســتەمی هۆرمــۆنیو فیزیکــی لــەش پەیوەندییــەکی پتــەوی بــە کــاری سیســتەمی دەمــارو ســاخلەمی جەســتەو گەشــەکردنی لــەش هەیــەو، هەروەکو کاریگەری زیندووی لەسەر سرووشتی مــرۆڤ هەیە.

کەواتـــە هۆکـــارە ڕەمەکییـــەکان، بـــەرەنجامی پێکهێنـــانی جـــینو کرۆمۆســـۆمەکان بـــوون بـــەڵام فاکتـــەرە پێکهاتەییـــەکان بـــەرەنجامی ڕەمـــەکیو ڕەحمیو فیزیکیو دەوروبەرن بە هەموویانەوە.

ج-فاکتــەری نەخۆشــییە ئۆرگانیــەکان Physical disease تووشــبوون بــە نەخۆشــییە فیزیکییــەکان (Somatic) بریتییە لە گۆڕانکاری لە پێکهاتەی لەشو لــە کۆئەندامــەکانی لــەشو سیســتەمی کۆئەنــدامی دەمار کە ئەبێتە هـۆی ڕوودانـی پەشـێوی دەروونـیو زەیـنی تـا ئەگاتـە ڕادەی خرفبـوون. لـەو نەخۆشـییە گرنگانەی کە کارئەکاتە سـەر ژیـریو ڕەوشـتی مـرۆڤ وەکو هـەوکردنی مێشك، تـای بـەرز، نەخۆشـییەکانی دڵ، بـەدخۆراکی، نەخۆشـییە درێژخایەنـەکان.. هتـد جگـە لـە ئـازارو لێـدانو بەرکـەوتنی سـەر. هـەروەها چــــەند جۆرێــــك لــــە دەرمانــــەکانو دەرمانــــە ئازارشکێنەکان ڕەنگە ببنە هـۆی گۆڕاکارییـە زەیـنیو دەروونییەکان بـە شـێوەیەکی کـاتی، بـۆ نموونـە مـادە سـڕکەرەکان بـە هـەموو جۆرەکانیـەوە، حـەبی منـاڵ نـەبوون، دەرمـانی فشـاری خـوێن ژاراوی بـوون بـە مادەکانی فلزو جیوەو ڕەساس.

بـۆ ماوەیـەکی زۆر دەمەتەقێیـەکی بـەردەوام لـە نێوان لایەنگرانی ئاراستە فیزیکیەکان کـە نەخۆشـیە دەروونیەکان ئەگێڕێتـەوە بـۆ هۆکـاری زینـدەگی، بـێ ئــــەوەی دان بــــە کاریگــــەری ئەزموونــــە کۆمەڵایەتییەکانـدا بـنێ، لەگـەڵ هاوکـارانی ئاڕاسـتە

كۆمەڵایەتیــە- ڕووناكبیرییــەكان، كــە لێكدانــەوە فیزیكییــەكان ڕەت دەكەنــەوە، جــەخت لەســەر ئــەوە دەكــەن كــە نەخۆشــیە دەروونیــەكان تــەنها ملكەچــی هۆكــارە كۆمەڵایــەتیو كەلتوورییــەكانن، لــە ئــەنجامی ئەم جیاوازییەوە لایەنگری هەر ئاڕاسـتەیەك ڕێگـەی ســـەربەخۆیان گرتەبـــەر بێئـــەوەی هاریكـــاری ئاڕاستەكەی تر بكەن، ئەمە بۆ ماوەیـەكی زۆر هـەروا مایەوە تا وای لە پسپۆڕەكانی یەكێ لە بوارەكـان كـرد تیۆری پسپۆڕانی بوارەكەی بەرامبەر پشـتگوێ بخـەن، تاكو دامـاڵینی تیۆرەكـان لـە تێڕامـانو قووڵبوونـەوەو خوێندنـەوەی سەرتاسـەری، نـاكرێ تـەنها لـە ڕێگـەی پشتبەستن بە بایۆلۆجیا یان تـەنها لـە ڕێگـەی واقعـی كەلتوریو كۆمەڵایەتیەوە بەدی بهێنرێ.

هەرچەندە لایەنگرانی قوتابخانە زیندەگییـەكانو قوتابخانـــە كۆمەڵایـــەتی- كەلتورییـــەكان، تـــۆزی دەمارگیرییـــان لـــە خۆیـــان تەكانـــدو باوەڕیـــان بـــە پێویسـتی چـاودێریكردن بـە لێكدانـەوەی هـەردوو جـۆری هێزەكـە لـە وەسـفی شـیكردنەوەی پەشـێوییە دەروونـیو زەینییـەكان هێنـا، بـەڵام تـاكو ئێسـتا لـە تیۆرییـــە زانســـتییە ســـەرجەمگیرییەكان بـــۆ ڕوونكردنـــەوەی پێوەنـــدی نێـــوان پرۆســـە

زیندەگییـــەکانو کاریگـــەرە کەلتوورییـــەکان لـــە ڕوودانی نەخۆشییەکان بێبەشین.

## حاڵەتەکانی ئەتنۆگرافی بۆ نەخۆشییە دەروونییەکان

دوای ئەوەی لە ساتەوەختە جیاوازەکانـدا شـوێنی کاریگەری لەسەر کەسـێتیو پەشـێوییە تەندروسـتیە- دەروونیەکانو دەرکـەوتنی نەخۆشـی دەروونیمـان بـۆ سـاغ بـووەوە، هەنـدێ حاڵـەتی ئـەتنۆگرافی لـە پاثولۆجیای کەلتووری بۆ هەردوو کۆمەڵی ئەسکیمۆو هەندێ تیرەی هیندییە ئەمەریکییـەکان لـە دووتـوێی واقعی کۆمەڵایەتیو کەلتووری ئەخەینە پێشچاو.

### (ئەسکیمۆو نەخۆشیی دەروونی "پیبلۆکتۆ")

مرۆناســـە هاوچـــەرخو دەروونناســـەکان لـــە تۆژینەوەکانیاندا لەسەر کۆمەڵانی ئەسکیمۆ، لە ناوچە سەهۆڵبەندەکانی باکوری کەنـەداو ئالاسـکاو گرینلانـد، نەخۆشـــییەکیان دۆزییـــەوە، نـــاوێکی خۆمـــاڵی یـــان

ناوچـــەییان لێنـــا (peblocto) کـــە زاراوەیەکـــە لـــە زمانـەکانی ئەسـکیمۆدا مانـای هسـتریا دەگەیـەنێ، ئـەم چەشـــنە هســـتریایە لـــە جەمســـەری بـــاکور Aretic Hysteriaدا هەیـە و تووشـی خـەڵکی ئەسـکیمۆو ئـەو کۆمەڵانـە دەبـێ کـە ناومـان هێنـان، زیـاتر لـە وەرزی زســـتاندا ســـەرهەڵئەدا[٢٩]. دیـــارترین ســـیمای ئـــەم نەخۆشییە، تووشبوو تووشی هەڵچوونێکی سۆزداریی سەرکەش دەبێو تووشـبوونەکە بـە تاوێك لـە گۆرانی وتـــــن دەســـــتپێدەکات، شـــــێوەیەکی هســـــتیری لـــەخۆدەگرێ[٣٠]، لەگـــەڵ ئەوەشـــدا ئـــەم تاوگیرییـــە هسترییە بـەدووره لەهـەر ئارەزوویـەکی شـەڕەنگێزانە، زیـاتر ئـەم نەخۆشـییە لـە نێـوان ژنـانی قـەیرەدا بڵاودەبێتـەوە، زیـاتر لـە پیـاوان. زۆرجـار تووشـبوونی مێینە لە ئەنجامی مردنی مێردەکەیـەوە یـان کەسـێکی نزیکییەوە یان لـە ئـەنجامی نیگـەرانی لەسـەر کەسـانی نزیك کە ماوەیەکی زۆرە لێی دوورکەوتوونەتـەوە، یـان بـە هـۆی ترسـی زۆرەوە لـە ئاینـدەی نادیـارو تەمومـژ، تـــووش دێ. نیشـــانەکانی ئـــەم نەخۆشـــییە، گریـــانی هیسـتیری لەگەڵدایـە یـان بـە بـێ مەبەسـت زۆر بـە خێرایـی دەچـێتە دەرەوەی مـاڵو خێـرا بـە ڕاکـردن دەگەڕێتـــەوە. زۆرجـــار ئـــەم تاوگیرییـــە لـــە خۆیـــەوە

نامێنێو نـەخۆش دەگەڕێتـەوە سـەر خـۆیو بەرەبـەرە هێور دەبێتەوە، ئەنجا دەست بە گریـانێکی کـپ دەکات کە ئەمەش ماوەیـەك دەخایـەنێو لەگەڵیـدا چـاوەکانی سوور دەبنەوە.

بۆ ماوەیەکی کورت لێدانی دڵی خێرا دەبـێ، لەشـی بـۆ ماوەیــەك دەسـتدەکات بـە لـەرزینو جـارێکی تـر ئەگەڕێتـەوە سـەر بـاری ئاسـایی خـۆی. تێبـینی کـراوە ئـەو کۆمەڵانـەی کـە ئـەم نەخۆشـییەیان تیـادا بـڵاوە بەشـداری چـەند سـیمایەکی کـەلتووری دەکـەن، بــە تایبــەتی کۆمەڵــەکانی ئەسـکیمۆ، ئـەو خەسـڵەتانەش ئەمانەن[٣١].

١-لــە منداڵانــدا پاڵنــەری پشتبەخۆبەســتن کــەم دەبێتــەوەو خـودی بـاڵا تێیانـدا لاواز دەبـێ، ڕەوشـتی پەروەردە پشت ئەستوورە بە خەڵکی تر.

٢-گرنگــــی بــــە بــــەها دەســــتەگەلییەکان Communalistic Value ئــەدەنو بـــە پەیوەندییـــە کەســـییەکانەوە پابەنـــدن کـــە لەســـەر بنـــەمای یەکترناسینو هاریکاری یەکترییە.

٣-پایـەی ژنـان لـە چـاو پیاوانـدا زۆر نزمـە، لەبـەر ڕوونـاکی ئـەو بیروبـاوەڕەی کـە حـەقی ژێردەسـتەیی ئەبەخشێ، ئازاری پاشکۆبوونی بە پیاو ئەچێژێ.

٤-بلاوبوونـــەوەی ڕاوبۆچـــوونی پەیوەنـــددار بـــە دەســـەڵاتی ڕۆحـــەوە بەســـەر مرۆڤـــدا لـــە ســـرووتە ڕۆحییەکان مۆرکێکی هستیری لەخۆ دەگرێ.

ئەم تایبەتمەندییـە هاوبەشـانە لای ئـەو کۆمەڵانـە ئەگـەر جـوزئیش بێـت وا لێکدەدرێتـەوە لـە سـیاقی واقعێکــی کــەلتووریو کۆمەڵایەتیــدا دەتــوانین لــەم هەڵچوونە دەروونیانە بگەین.

ئاسـتی گونجـاوی هاریکـاری دەسـتەجەمعیو هێـزی پشتبەستن بە سـۆزی یـەکتریو هێـزی جەختکردنـەوە لەســەر هەڵوێســتی هاریکــاریو تــەواوکاری تــەنها لــە چــەند دەروازەیـــەکی کـــەلتوری پەســـەندکراو وەکـــو چـالاکی وتـاردانو ستایشـدا خـۆی دەبینێتـەوە، کـە ئـەویش لـە یـەکێتی کۆمەڵایـەتیان هەڕەشـە ناکـات، ئـەگینا زۆر کـەناڵی پاککردنـەوەی سـۆزی سـلبی وەك ڕقو کینەو ئیرەیـیو گومـان هـەن شـاراوەنو ئـەتوانین بڵێین هۆکاری سلبین بۆ سەر دەروونی تاك.

مامۆســتا دکتــۆر النــوری ئامــاژە بــەوە دەکــا، کــە پەخشــندەییو ئامــادەگی گــەورەو گیــانی هاریکــاریو کێشــەی دەســتەگەری کــە کەســێتی ئەســکیمۆی پــێ دەناســرێتەوە، ئەگــەر بــە شــێوەیەکی کــەمیش بێــت ئـــەوەمان لا گەڵاڵـــە دەکـــات، هـــۆی تەشـــەنەکردنی

بــــەرفراوانی دیـــاردەی هەڵچـــوونە ســــۆزمەندییە هســـتیریەکان لای ئـــەم دەســـتەگەلانە چ لـــە شـــێوەی پێکەنینی تاوگیری توندا بێت یان لـە شـێوەی گریـانی هـاوار ئـامێز[٣٢] بێـت دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو پێکهاتـە کۆمەڵایەتیـیـــە کەلتوریـیـــەی کـــە حـــوکمی واقعیـــان دەکات، ئەمەیە وا لە تاکەکان دەکات بـەرەو شـێتگیری هستیری پاڵیـان پێـوە بنێـت لـە جیـاتی ئـەوەی بـەرەو شـــێوەی تـــری تـــاوگیری پاڵیـــان پێـــوە بنێـــت وەکـــو پارانۆیا[٣٣] و دەردی خەمۆکی[٣٤] (بۆ نموونە).

هیندییە سوورەکانو نەخۆشی دەروونـی (ونـدیگۆ) نەخۆشـی (ویـنـدیگۆ) Windigoی دەروونـی لـە نێـوان دانیشـــتوانی هەنـــدێ تـــیرەی هیندییـــە ســـورەکانی ئەمەریکا لە هەرێمی نێوان نیمچەدورگەی ئـەبرادۆرو دەریاچەی وینیگ لە ئەمەریکای باکور، بەدەرئەکەوێ، بە تایبەتی لە نێوان هـەردوو هـۆزی ئوجیبـوا Ojibwa و گریك Greek. ویندیگۆ لە زمانی ئەم هۆزانـەدا نـاوی دێویێکە لـە بـەفری ئەفسانەییو لەسـەر گۆشـتی مـرۆڤ ئەژی، هێزێکی لە ڕادەبەدەری لەسەر سروشتدا هەیـەو مـرۆڤ ڕاودەکـا، هـەروەکو ئەفسـانەو بیروباوەڕیـان بـەو جۆرە گوزارشـت لـەو دێـوە دەکـات[٣٥] ئـەم زاراوەیـە لـە لایەن مرۆناسەکانەوە بەکاردەهێنرێ وەکو ئاماژەیـەك

بـۆ نەخۆشـییەكی دەروونـی كـە مرۆناسـەكان لـەو هۆزانەدا دۆزییانەوە، ئەم نەخۆشییە تووشی نێرو مێ دەبێو نیشانەكانی بەرەبەرە بە دیـار ئەكـەونو دوایـی نامێنێو بە شێوەی نۆرە جارێكی تر دەرئەكەوێتەوە.

یەكەم نیشانەی ئەم نەخۆشـییە تووشـی خـەمۆكی دەبـێو ئـەنجا تووشـی ئێڵنجـدانو بێزلێهاتنـەوە لـە زۆربـەی خۆراكـە خۆماڵییـەكان دێـت. ئـەنجا خـەیاڵی پارانۆیـا Paranoia سـەری تێئـەكا، ترسـی لـە سـیحربازەكان پـاڵی پێـوە ئـەنێ. بـیر لـە خۆكوشـتن بكاتـەوە یـان خـەڵك بكـوژێ، خـەیاڵی نەخۆشـەكە دەئاڵۆسـكێ تـا ئەگاتـە بـاڵاترین ڕادەی نەخۆشـی، وا بیردەكاتـەوە چـووەتە پێسـتی كەسـێتی دێوەكـەی (ویندیگۆ)وە، بۆیـە خـەڵكی دەوروبـەرو خێزانەكـەی خۆی وەكو نێچیری پڕتـامو لـەزەت دەبـینێو ئـارەزوو دەكـات گۆشـتەكەیان بخـوات. لێـرەوە قۆنـاغی نەخۆشـییەكە ترسـناك دەبـێ، ئـەو كاتـەی ئامادەكاری تەواوی هەیە خەڵك بكوژێو ڕاویان بكات، بۆیە خەڵك ناچار دەبێ، بـیر لـەوە بكاتـەوە خـۆی لـێ ڕزگـار بكـات، پێش ئەوەی یەكێكیان پارچەپارچە بكات.

لەنێو ئەو كەسـانەی كـە ئـەم نەخۆشـیەیان خسـتە بـەر بـاسو تۆژینـەوە مامۆسـتا هالویـل Hallowell[٣٦]

بـوو، کـە وایـدەبینێ نەخۆشـی وینـدیگۆ ئاوێتەیەکـە Complex لـە فاکتـەرە سرووشـتیو کەلتوورییەکانـەوە پەیدابووە، لای ئەم کۆمەڵانە، نیشانە جەستەییەکانی نەخۆشـی، لێکدانـەوەی خـەڵك بـۆ ئـەم نەخۆشـییەو کـارلێکی هەڵوێسـتی نـەخۆش لەگـەڵ ئـەو تاکانـەی بەریـەك دەکـەون، لەگـەڵ واقعـی دەروونـی کایەیـەکی سیحرئامێز لایان بەرجەستە دەکات. دوای دەرکـەوتنی یەکـەم نیشـانەی نەخۆشـییەکە، نـەخۆش یەکسـەر تووشی ڕاڕایی دەبێ، چونکە ئـەو نیشانانەی لـە لەشـیا دەرئەکـەون وەکـو ئێڵنجـدانو ڕشـانەوە، لای کۆمەڵگـە ئەبنـە بەڵگـەی حـەتمی بـۆ تووشـبوون بـە نەخۆشـی ویندیگۆ لەگەڵ بەردەوامبوونی ئەم نیشانانە نـەخۆش تووشـی ڕاڕایـی زیـاتر دەبـێ تـا دەگاتـە لوتکـە، بۆیـە خەڵك دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە بە شێوەیەکی حاشا هەڵنـەگر تووشـی ئـەم دەردە بـووە. بۆیـە دەبێتـە هەواڵێكو بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر لە ڕێگەی لـە دەنگۆوە لـەنێو تاکەکانی کۆمەڵدا بڵاودەبێتـەوە، تـاکو دەگاتـە ئـەوەی سـیحر بەسـەر ئـاوەزدا زاڵ دەبێـت، نـەخۆش زیـاتر دوودڵ ئـەبێ، چـونکە پێـی وایـە نەخۆشـییەکەی لـە ئـەنجامی کاریگـەریی ئـەو سـیحرکردنەوە (واتـە پێـی وایـە جـادووی لێکـراوە)

دروستبووە. بەو جۆرە فاکتەرە کەلتووریو فیزیکیو دەروونییەکان لێیدا کۆدەبنەوە تاکو گومانلێکراوەکە ئەکەوێتە گێژاوێکەوە کە زەحمەتە لێی دەرچێ، شەو و ڕۆژ لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵدا دەمێنێتەوە، دوای ئەوەی نووشدارە جادووبازەکان ناتوانن چارەسەری بکەن، نەخۆش خۆی داوا دەکات بیکوژن. زۆرجار داواکەی جێبەجێ دەکرێ بەو سیفەتەی تاکە چارەسەرە کە نەریتە کۆمەڵایەتییەکان بڕیاری لەسەر دەدەن. هەرچەندە لێکدانەوەی تر بۆ هۆکاری توشبوون بە ویندیگۆ هەیە، جیاواز لەو بۆچوونو بنەمایانەی پشتی پێئەبەسترێ، بەڵام بە گشتی لێکدانەوەی ژینگەیی یان جوگرافیو لێکدانەوەی کەلتووری بۆ ئەم نەخۆشییە هەیە، جگە لە لێکدانەوەی دەروونی کلینیکی.

خاوەنی لێکدانەوە ژینگەییو جوگرافیەکان پێیان وایە کە ئەم نەخۆشییە لە هەلومەرجێکی سروشتی دژوارەوە سەریهەڵداوە، گوایە ئەو بەروبوومەی کۆمەڵی ویندیگۆ لەسەری دەژین زۆر کەمە، بۆیە ناچار بووە گۆشتی مرۆڤ بخوات تاکو ئەم ئەزموونە لە دابونەریتدا سەپێنراوە، بەڵام ئەم لێکدانەوەیە لێکدانەوەیەکی زۆر سادەیە، ئەوان دەڵێن

دووبارەبوونـەوەی ئـەم ئەزموونـە کـە گۆشـتی مرۆڤـی تێدا خووراوە، بە هۆی چیرۆك‌و هەقایەتەوە دەمـاودەم باسـکراوە تـا لـە مێشـکیاندا چەسـپیوەو بـووە بـە بـاوەڕێکی ڕۆحـی بـەهێز کـە ناوەنـدێکی بـەهێزی لـە فکری ڕۆحی گشتی ئـەم کۆمەڵانـەدا هەیـە، ئـەوەی کـە فۆبیای نەخۆشییەکان لای تاکەکان ئەیخولقێنێ، بـەرەو کەشێکی دەروونی نالەبار پاڵیپێوە دەنێ بە ڕۆڵی خۆی نەخۆشییەکە بەو شێوەیەی بەسەرماندا ڕابورد گـەورە دەکاتەوە. بەڵام ئـەم ڕاوبۆچوونە تووشـی بەرهەڵسـتی زۆر بـووەوە، لەوانـە فاکتـەری ژینگـەی سرووشـتی بـە تـەنها بـۆ لێکدانـەوەی ئـەم نەخۆشـییە نـاگونجێ. بـۆ نموونە ئەسکیمۆکانی جەمسەری بـاکور لـە هـەرێمێکی جـوگرافی زۆر دژواردا دەژیـن، هـەژارتر لـە هـەرێمی هۆزەکـانی ئۆجبـواو گریـك، لەگـەڵ ئەوەشـدا تۆژەرەوەکـان هـیچ شـوێنەوارێکی نەخۆشـی وینـدیگۆ، یـان هاوشـێوەی ئـەو نیشـانانە وەکـو کاینالیـەت واتـە گۆشتی مرۆڤ خواردن، بەدی نەکرد.

کەواتـە ئەگـەر ژینگـەی سروشـت بـە تـەنها بـۆ لێکدانەوەی نەخۆشی ویندیگۆ بەس نـەبێت، پێویسـتە لێکدانەوەی کەلتووری بۆ واقعـی هـۆز یـان کۆمەڵەکان

کــە تووشــی ئــەم نەخۆشــییەو هاوشــێوەی ئــەم نەخۆشییانە دێن، بکرێت.

مرۆناســەکان پێیــان وایــە، بنــەمای کــەلتووری بــۆ وتوێژو لێکدانــەوەی نەخۆشــی ویـنـدیگۆ یـان نەخۆشـی لەو بابەتە لە میانەی تـەوزیفکردنی دیـدی کـەلتووری بۆ بابەتەکە یەکێ بـوو لـەو بنەمایانـەی کـە تۆژینـەوە مەیدانیــەکان بــۆ واقعــی نەخۆشــییەکە لای هــۆزی ئۆجبوا پشت ئەستوور بوون پێی، ئەم تۆژینەوەیە لەو کۆســـپو تەگــەرەو ئاســانکارییانە دەکۆڵێتــەوە کــە پابەنـدە بـە دابونـەریتی ئـەم هۆزانـەوە، سـەبارەت بـە لایەنی سۆزداریی ئەندامانی ئەم هۆزانـە. تۆژەرەوەکـان تێبینییــان کــرد کــە کۆمەڵگــەی ئۆجبــوا، کەرەسـتەی ڕادەربــڕینو دڵدانــەوە بــۆ پاڵنــەرە شــەڕانگێزیو ڕقو کینەکانی شك نابات، چونکە بەربەستی جۆراوجـۆر لـە ڕێگــەی ئــەم پاڵنەرانــەدا هەیــە ئــەویش شــێوازی ڕێزگرتنو ڕاگرتنی شعوری بەرامبـەرە لەگـەڵ زۆرێـك لـە یاسـاکانی ڕێگـریو تـەحریم کـردن، بۆیـە لێـرەدا تاکەکان لە ڕێگەی وروژاندنی دەنگـۆو جادووگەرییـەوە خــەمی دڵیــان ئەرەوێنینــەوە هــەر کــاتێ بیانــەوێ گوزارشت لە سۆزەکانی ڕقو کینـەو کاری شـەڕەنگێزی بکەن.. ئەم هۆیانەش لەگەڵ ئـەو ڕایـەدا ئـەگونجێ کـە

مامۆستا هالویل بۆی چووە، ئەو پێی وایە نەخۆشی ویندیگۆ وەسیلەیەکە بۆ ڕزگاربوون لەو سۆزە پەنگخواردووەی  کە خۆی لەو ڕق و کینەو دوودڵییەوە دەبینێتەوە، کە هۆزی ئۆجیوا لە چارەی نووسیوە.

وەسفی پێشوو بۆ نموونەی ئەم نەخۆشییانەو ئەو کەلتوورەی کە جێی ئەم نەخۆشیانە دەکاتەوە، ئامانجی دیاریکردنی نەخۆشیەکان نەبوو هەروەکو لە تۆژینەوە دەروونیە کلینیکییەکاندا، هاتووە، بەڵکو جەخت لەسەر چەند دیاردەیەکی کەلتووری دەکاتەوە، لە هەلومەرجێکی دیاریکراو و بە تەبیعەتی خۆی ئەبێتە هۆی پەیدابوونی چەند حاڵەتێکی نەخۆشی دەروونی. ئەم ئاراستە کەلتوورییە ئەتنیە، لێکۆڵینەوەی نەخۆشییە دەروونی و دەردە تەندروستیەکان بە شێوەیەکی ئاسانتر دەگرێتە ئەستۆ، واتە بە لابردنی ئەو کۆسپانەی کە هەلومەرجی تاکەکانی کۆمەڵگەی تەمومژ کردبوو، ئەمەش ڕێخۆشکەرە بۆ گۆڕینی تۆژینەوەی نەخۆشییە دەروونیەکان لە چوارچێوەی تاکەوە بۆ چوارچێوەیەکی کەلتووری و کۆمەڵایەتی.

## بەشی دووەم

## پرۆسەو نەریتە کۆمەڵایەتییەکانو ڕۆڵیان لە تەندروستی گشتیدا

لە بەشی پێشوودا، کەلتوورمان بەوە پێناسە کرد، کە کۆی گشتی شێوازەکانی ڕەوشتی وەرگیراوو ئاراستەو ئەو بەهاو پێودانگانەیە کە تاکەکانی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو بەشداری تێدا دەکەن- بە پێی پێناسەی لینتۆن.. کەلتوور لەو ڕەوشتو پێودانگانە پێکدێ کە تاکەکانی گرووپێکی ڕۆشنبیری بەشداری تێدا دەکەن، ئەو میراتە کۆمەڵایەتییەش چارەسەری ئامادەی بۆ کێشەو تەنگژەکانمان هەیە. ئەویش کۆمەڵێك شێوازە تاکەکانی کۆمەڵگە هەڵیدەگرن تاکو خۆیان لەگەڵ ژینگە دەرەکیەکانو تاکەکانی تردا بگونجێنن. هەرچەندە چارەسەری بۆ کێشەی ئەو تاکانە هەیە، بە هەمان ئەندازەش کێشەیان بۆ دەخوڵقێنێ[٣٧]. ئەم ڕەوشتو مومارەسە پشتپێبەستراوانە لە لایەن ئەندامانی کۆمەڵە ڕۆشنگەرییەکانەوە خۆی لە چەند نەریتێکی کۆمەڵایەتی دەبینێتەوە، بەو پێیەی ئەو ڕەوشتو

بەهایانەی کە کۆمەڵی کۆمەڵایەتی بە ڕاستو پەسەندی دەزانێ، ئەگەر لەگەڵ کەلەپووره ڕۆشنگەرییە هەنووکەییەکان بەراوردی بکەین[٣٨] کەرەستەو سەرچاوەی مەودایەکی درێژخایەنن، تاکو ڕێ بەڵەدیی ژیان بکەن. ڕوونترین تایبەتمەندیی، دەستکەوتێکە خەڵك فێری دەبێو لە ماڵو دەوروبەرو کێلگەو یەکە کۆمەڵایەتیو کەلتوورییەکانی تردا دەماودەم دەگێڕدرێتەوە تاکو دەگاتە کۆمەڵگە گەورەکە[٣٩].

کێشەکانی تەندروستی گشتی لەو بوارانەی کە کەلتوورەکان لە میانەی باوەڕو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەی ئەنقەستو نائەنقەست، ئەیخەنە ژێر چاودێرییەوە لەوەدایە، هەرچی ئەنقەستە یان بە مەبەست ئەنجام دەدرێ، لە ڕێگەی ئەو هەوڵانەوە دەبێ کە مەبەستی نەهێشتنی نەخۆشیو بەرزکردنەوەی ئاستی توانا جەستەییو دەروونیو زەینییەکانە بۆ ئەندامانی کۆمەڵگە، بە هۆی هەوڵو مومارەسە دەستەجەمعییەکانەوە بەرەنگاری پەشێوییەکانی کۆمەڵگە دەبنەوە، تاکو چاودێرییەکان سەرتاسەری قۆناغەکانی ژیان دەگرێتەوە، بۆ نەهێشتنو لابردنی نەخۆشییەکانی

پەککــەوتنو کەمئەنــدامی هــەروەها خۆپاراســتنو کوتـان دژی نەخۆشـی(٤٠). بـەڵام مومارەسـە و نەریتـە نائەنقەسـتەکان کـە کاریگـەری لەسـەر تەندروسـتی گشـتی هەیـە (هۆکارەکـانی نەخۆشـیو خۆپاراسـتنو چارەسـەرکردن) لـە میانـەی نـەریتو ڕێسـاو بـەهاو بیروباوەڕو توخمە ڕۆشنبیریەکانی ترەوە دێتە ناوەوە بە خۆراكو پاكو خاوێنیو وەسیلەکانی دابینکردنو شێوازەکانی بژێویو ڕێوڕەسمی پەرستگاکانەوە.. هتد پابەندە. لە هەندێ لێکۆڵینەوەدا پەیوەندی پتـەو لـە نێـوان نەریتـە باوەکـان لـە لادێ وەك مەلـەکردن لـە ئاوی جۆگەلەو کارێزەکان، دابەزینی جوتیـار بـە پێـی پەتی بۆ ناو جۆگـەکانی ئـاودێریو گۆلاوەکـان لەگـەڵ نەخۆشــی بــەلهارزیادا هەیــە. ڕاهــاتن لەســەر جـل شوشتنو ڤـاپو قاچـاغو سـەوزە شوشـتنەوە لـە ئـاوی جۆگەلە یان نزیکی کە هەندێ جار لـە هـەمان شـوێن خۆیان دەشۆنو میزو پیسیشی تیا ئەکەنو (لە لایەن مــرۆڤو گیانەوەرەکانــەوە). ئەمانــەش دەبنــە هــۆی نەخۆشــی جۆراوجــۆر بــە هــەمان شــێوە نەریتــە کۆمەڵایەتیــــــەکان تـــــــوخمی خۆپــــــارێزیو چارەسەرکردنیشــی هــەلگرتووە —لــە دێڕەکــانی داهــاتوودا لێــی ئــەدوێین) هــەروەها نەریتــە

کۆمەڵایەتییەکان هۆکارێکی یەکلاکەرەوەیە لە جیاکردنەوەی تووشبووی نێرو تووشبووی مێ لە ژینگە گوندیەکاندا. مێینە کەمتر تووشی دەبێت لە پیاوان —وەکو بەلهارزیاو لیشمانیا لە ئەنجامی ئەو نەریتەی کە کچانی لە ماڵەوە بەند کردووە ناتوانن لە ماڵ دەرچن بە تایبەتی دوای تەمەنێکی دیاریکراو، بواری نادا لە جۆگەلەکاندا مەلەبکات بەڵکو دەبێ جلی شۆڕو داخراو لەبەربکات[٤١].

لە میانەی باسکردنی کەلتوردا باسی شوێنەوارو نەرتیە کۆمەڵایەتیەکانمان کرد —لە تووشبوونی بە هەندێ نەخۆشی دەروونیو زەینی، هەروەکو ڕۆڵی خۆپاراستنو چارەسەرکردنیش لە دژی ئەم نەخۆشییانە باسی لێوە کرا، هەروەها ڕۆڵی نەریتە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێبەری کردنی ئاراستەکاندا ڕوونە، تاك لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا ئەژیو کەلتوورێکی دیاریشی هەیە، ئاڕاستەکانی ڕووبەڕووی خەڵكو شتەکانو دیاردە تایبەتەکان دەکاتەوە، بە تایبەتی نەخۆشیو تەندروستی، بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشی پێویستی بە دروستکردنی ئاراستە پەلامار دەرییەکانە کە خەڵك هاندەدا بۆ بەرەنگاری نەخۆشی —بە خۆپاراستنو چارەسەرکردنەوە- بۆیە

وا دەخـوازی ئاراسـتە پۆزەتیفـەکان بـەرەو فیکـرەی پاکوخــاوێنیو نەریتــە تەندروســتیەکان بچــێنین، هەروەکو لە ڕێوڕەسمی ئیسلامیدا باسی تەندروستیو پاکوخــاوێنی هــاتووە، بــە تایبــەتی (النظافــة مــن الایمان)، بـە پێـی ڕێوڕەسمـەکان لەگـەڵ سـرووتەکانی خواپەرسـتیدا دەسـتنوێژ هـەڵگرتن بـە لای کەمـەوە هەنــدێ نەخۆشــی بــەکتیری یــان میکرۆبــی کــەم دەکاتــەوە، ئــەوەش پەیوەســتە بــەو باکگراونــدە مەعریفییــەوە کــە لەگــەڵ نەریتــە میراتگرییــە کۆمەڵایەتیەکاندا بەراورد کراوە[٤٢].

ئــەم باکگراونــدە مەعریفییــە لــە فەلســەفەی کۆمەڵایەتیـدا کـە پشـت ئەسـتوورە بـە فەلسـەفە خۆماڵییەکان- باسی دیاردە مرۆییو بوونەوەرییـەکان لەخۆ دەگرێ، بە تایبەتی دیاردەی نەخۆشی بە پێـی چەند چەمکێکی تایبـەت باسـی دەکات، بـەو جـۆرەی بەشـێکە لـە کەرەسـتەی قەڵاچـۆکردنی نەخۆشـی- خۆپاراسـتنو چارەسـەرکردن- نەخۆشـیو چوارچـێوە کەلتوورییەکــە بــۆ کۆمــەڵێك بــەهاو نــەریتی کۆمەڵایەتی بـاو پێکـەوە گـرێ دەدا[٤٣]. هـەر ئەوەشـە پـاڵی بـە ئـەنثرۆپۆلۆجییەکانـەوە نـا بـە شـێوەیەکی زینـدوو گرنگـی بـە چـەمکی نەخۆشـی لـە کـەلتوورە

جیاوازەکانـــدا بـــدەن، ئـــەوەش کاریگـــەریی لـــە ئاراســـتەکردنی نەریتـــە کۆمەڵایـــەتیو مومارەســـە چارەسەریو خۆپارێزییەکاندا هەبوو، کە کۆمـەڵ لـە میانـــەی وەرگرتنـــدا شـــێوازی کـــارکردنی لەگـــەڵ نەخۆشـیدا گەشـە پێـدەدا بـۆ بەدەسـتهێنانی کایـە جۆربەجۆرەکانی پزیشکی[٤٤]. چەمکەکانی نەخۆشی هەمیشـــە باســـی هۆکـــانی نەخۆشـــیو شـــێوازی بەرگریکردن لە نەخۆشی دەکات، ئـەم چـەمکانە بـە مومارەســەو نەریتــە کۆمەڵایەتییەکانــەوە بەســتراون کـە کارلێـك دەکـاو ئەبێتـە هـۆی دەربـڕینی جـۆری ڕەوشت لە چوارچێوە کەلتووریو کۆمەڵایەتییەکانـدا لە کارکردنی لەگەڵ هەڵوێستا.

لــەو کۆمەڵگانــەی کــە هێــزی لــە ڕادەبــەدەری سرووشت بەرپرسیار دەکەن لـە بـاران بـارینو وشـکە سـاڵی، هـەر ئـەو هێزەیـە بەرپرسـیارە لـە نەخۆشـی. بـەڵام ئـەو کۆمەڵانـەی بـە دیدگایـەکی میکـانیکی بـۆ دونیـا دەڕوانــن بــە شــێوەیەکی گشــتی پێیــان وایــە هۆکــانی نەخۆشــی هۆکــاری میکانیکییــە. زۆر لــە هیندییـەکانیش پێیـان وایـە، خـواردن بـە شـێوەیەکی نــەگونجاو "ســارد" یــان "گــەرم" ئەبێتــە هــۆی ژمارەیـــەکی زۆر لـــە نەخۆشـــی. لەگـــەڵ ئەوەشـــدا

باوەڕیـان بـە کاریگـەری فاکتــەرە سـایکۆلۆجییەکان سـەبارەت بـە هۆکـانی نەخۆشـیو شـێوازی بـەرگری، هەیە[٤٥].

کەواتــە چــەمکی تەندروســتیو نەخۆشــی لــە تەقلیـــدی هـــەموو کۆمەڵگەیەکـــدا پابەنـــدە بـــە قەڵاچـۆکردنی نەخۆشـییەوە ئـەتوانین ئـەوەش بـە پەیوەندیی نێوان لێکدانەوەی کـەلتوورو نەخۆشـی[٤٦] و نەریتــە کۆمەڵایەتییــەکان ناوببــەین، کــە لــە بەرگریکردن لە نەخۆشی، بەرپرسیارن.

ئەگـەر لـە ژینگەیـەکی دیـاریکراودا نەخۆشـییەك لە نەخۆشـییەکان بـە هـۆی ڕۆحـە شـەڕەنگێزەکانەوە بڵاوبـووەوە، ئـەوا خـەڵك پـەنا ئەبەنـە بـەر شـێوازی نادیــارو غــەیبی لــە خۆپاراســتنو چارەســەرکردن، ئەمــەش ئەبێتــە کۆسـپێك لـە بـەردەم بـەدیکردنی هۆکـــاری ڕاســـتەقینەی نەخۆشـــی، پرۆســـەی بـەرگریکردن لـە نەخۆشـی پەکـدەخات. لـە ژینگـەدا لێکدانــەوەی میکـانیکی یـان سروشـتی بـۆ نەخۆشـی هەیە، بەڵام ڕەنگە لێکدانەوەی هەڵە بـن، چونکە لای هەنــدێ لـە گوندنشـینەکانی میسـر نـەریتێکیان لا گەڵاڵە بووبـوو حاڵـەتی تووشـبوون بـە بـەلهارزیا لـە نیشانەکانی کە میزەکەیان خوێنی لەگەڵ بوو، ئـەوان

پێیان وابوو ئەمە نیشانەی بالْق بوونە، بۆیە نەخۆشییەکە ڕۆژ بە ڕۆژ زیادی ئەکرد، بەلآم ئەوان گوێیان پێ نەدەدا[٤٧].

لە کۆمەڵگەی خۆشماندا قەڵەوی هێمای جوانییە، ئەوەی پێی دەڵێن شۆخو شەنگی (رشاقة)، لای ئەوان بەڵگەیە بۆ بەدخۆراکی، مناڵی قەڵەو پێیان وایە زیاتر ئەگەری ئیرەیی پێبردنی لەسەرە[٤٨]. ئەمەش بەڵگەیە بۆ گرنگیی تێگەیشتن لە لێکدانەوەی خەڵك بۆ نەخۆشی. هەروەها تێگەیشتنیان سەبارەت بە تۆژینەوە کاریگەرەکانی نەریتو مومارەسە کۆمەلآیەتیەکان لە بەرگری نەخۆشیدا گرنگی خۆی هەیە، چونکە پشتبەستن بە توخمە کەلتوورییەکانی تر لە چوارچێوەی گشتیدا، بە لێکدانەوە سەرجەمگیرییەکانەوە بەستراوە.

مومارەسەو نەریتە کۆمەلآیەتییەکان کە بۆ مەبەستی تەندروستی گشتی ئاڕاستەکراونو چەمکەکانی لە ژینگەی کەلتووری وەردەگرێو شێوازەکانی بە پێی چەند وێنایەکی جۆراوجۆر، لە کارلێکی مرۆڤایەتیو ژینگەی سرووشتی وەرگرتووە، لەو سەرچاوانە وەکو گیای پزیشکی، بەردی پیرۆزو لم، سوودی بەو ژینگەیە گەیاندووە، بەلآم بەبێ

شـــارەزایی مرۆیـــی لـــە میانـــەی ڕۆشـــنگەرییە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بـە تـەنیا نـەیتوانیوە نەخۆشـی چاکبکاتەوە، ئـەم شـارەزاییەش بـە هـۆی کەلـەپووری سـەرزارەکییەوە وەکـو پەنـدو چـیرۆکی میللـیو مومارەسـە نوژداریـیەکان گەیـەنراوە خـەڵکانی تـر، ڕۆژانە لە ڕێگەی ڕاهێنانی کەلتوورییەوە، لـە ڕێگـەی چـالاکی ڕۆژانـــەوە، لـــە ڕێگـــەی ســـروودتەکانی خواپەرسـتیەوە، یـان لـە میانـەی ئـەو کـردە (مەبەسـت)یانـەوە، کـە نووشـدارە میللـیو بەختگرەوەکان یان نووشدارە جادووبازەکان ئـەنجامی دەدەن.. دەڕژێتە ناو مومارەسەی ڕۆژانەی خەڵکەوە.

لـــە ڕاســـتیدا ڕێگـــەکانی خۆپاراســـتنو چارەسـەرکردنی تایبـەت بـە تەندروسـتی گشـتیو چارەسـەری نەخۆشـی، ئـەو کەرەسـتەو توخمـە کەلتوورییانە دەگرنەخۆ کە وەزیفـەی پەیوەست بـە پێکهاتـە کۆمەڵایـەتیو کەلتوورییـەکانی جێبـەجێ دەکـات، لەبەرئـەوە لـە تۆژینـەوەی مرۆناسـیی پزیشکیدا چەند بەشێك بـۆ لایـەنی چارەسـەرکردنو خۆپـارێزی دەکەینـەوە. هەرچـەندە نـاکرێ لایـەنی خۆپـارێزی لـە لایـەنی چارەسـەرکردن، جیابکەینـەوە بـــەڵام (مەبەســـتدارێتی) لـــە مومارەســـەی

چارەسەرکردنو دەرکەوتنی ئامانجەکەی، لەگەڵ پێویستی بوونی چارەسەرکار لەگەڵ مومارەسەکاری خۆپاریزی لە نەخۆشیو پێداگرتن لەسەر نەریتە کۆمەڵایەتییەکانو هەندێ لایەنی مەبەستداریێتی، زۆرجار ناچارمان دەکات لە یەکیان جیابکەینەوە:

**١-لایەنی خۆپاراستن لە لێکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆژیای پزیشکیدا**

لێکۆڵینەوە ئەنترۆپۆلۆژییە تازەکان کە بە هۆی ئەو پەیوەندییە زۆر نزیکانەی نێوان مرۆناسیو بوارە پزیشکییەکان هاتە بەرهەم، سەلماندیان کە باوەڕو هەڵوێستە دەروونییە نادیارەکانو نەریتە کۆمەڵایەتیەکان، شوێنەوارێکی گەورەیان لە واقعی تەندروستی زەینیو دەروونیو جەستەیی، دوای ئەو زنجیرە تۆژینەوەیەی کە شێوازی میللی لە بوارەکانی خۆپاراستنو چارەسەرکردندا بە تایبەت لە کۆمەڵگە تەقلیدییەکاندا گرتەبەر[٤٩]، بەجێهێشتووە. نەخۆشی دیاردەیەکی تەندروستیە کە سروشتێکی کۆمەڵایەتی کەلتووری لەخۆ دەگرێ، بە حوکمی بڵاوبوونەوەی لە نێوەندە کۆمەڵایەتیو کۆمەڵە مرۆییەکاندا، تاکو ببێتە دیاردەیەکی پابەند بە هەر کۆمەڵێکەوە، بۆ ماوەیەکی زەمەنیی دیاریکراو، چونکە ئەو کۆمەڵەی

کە یەکێك لە نەخۆشییەکان تیایدا بڵاودەبێتەوە، ئاراستە کۆمەڵییەکان بەرەو ڕووی دەچێ، شوێن شێوازی ڕەوشتێك دەکەوێت، لەناو کۆمەڵدا بە نەریتە کۆمەڵایەتییە کەلتوورییەکان دەناسرێت. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی یان بەرهەڵستیکردنی نەخۆشی کاریگەری یان کارتێکردنی لە لایەن پێکهاتە کۆمەڵایەتییە هەنووکەییەکانەوە هەیە، ئاستی ئابووری کۆمەڵگە، چانسی تاکەکان سەبارەت بە فێربوونو کارامەییو پەیوەندی کەلتووریو سروشتی سیستەمی سیاسیی باوو سیستەمو مرۆڤو شتی لەو بابەتە هەموو ئەمانە وابەستەی تووشبوون بە نەخۆشین، هەرچۆن وابەستەی چالاکی پرۆسەی چارەسەرکردن یان بەرگری لە پێناو خۆپاراستن[٥٠] بوون.

لە پێناو ئەم فرمانەدا پسپۆڕانی کایە زانستییە مرۆییەکان لە ڕووی پزیشکییەوە گرنگییان بە تۆژینەوەکانی سیستەمو ئابووریو مرۆڤو خزمایەتی، توێژبەندی کۆمەڵایەتی، سرووتو باوەڕو شێوازەکانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیدا لە پەیوەندی هەموو ئەو حاڵەتانە بە باری تەندروستی مرۆڤەوە. ڕێگەو شێوازی پەروەردەی منداڵ، خۆراكو

پاکوخاوێنی، گوزارشتی سۆزداری جۆری سۆزمەندی باوی ناو کۆمەڵ، شێوازی ئامادەگی بۆ ژیانی گشتی، بەهاو نموونە باوەکانو جۆرەکانی بەرهەمهێنانو هەلومەرجی ئابووریو کەشی کارکردن و جۆری نیشتەجێبوونو مادەی بیناکاریو شوێنو پەیوەندی بە ژینگەوە هەموو ئەمانە وەکو توخمی کەلتووری ناسراون، بە ئەندازەی ئەوەی ئەوانەی سەرەوە فاکتەرو شوێنکەوتەی نەخۆشین، بە هەمان ئەندازەش فاکتەری چالاکن لە بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشیو تووشبوون بە نەخۆشی لە کۆمەڵگەکانی تردا.

پاکوخاوێنی نموونەی بەهایەکی گرنگە لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا. پێغەمبەری مەزن (د. خ) ئەفەرموێ (پاکوخاوێنی لە باوەڕەوەیە) ئەم وتە پیرۆزە وەکو قەڵغانێکی پارێزەر بۆ زۆربەی نەخۆشییەکان چاوی لێدەکرێ، بە پێچەوانەی هەندێ کۆمەڵگە کە بە هەمان ئاو لە دەفرێکدا چەند کەسێك دەشۆن یان هەندێ کۆمەڵگەی ئەفریقی سەرەتایی هەندێ ئەندامی لەشی بۆ ماوەیەکی زۆر ناشوات، لەبەر هەندێ هۆی ئیکۆلۆجیو ڕێورەسمی باوەڕپێکراو. لە زۆر

کۆمەڵگەدا شێوازی خواردنەکانیانو جۆری خواردن لایان ئەبێتە هۆی هەندێ نەخۆشی وەکو بەدخۆراکی، بۆ نموونە خۆراك قووت دەدەن بێ ئەوەی بیجوون.

یا برێکی زۆر خواردن دەخۆن بێ ئەوەی بیر لە پێویستیەکانی لەشو حەوانەوەی گەدە بکەنەوە. پێچەوانەی ئەمانە کۆمەڵگەی تر هەن نەریتەکانیان وایە خۆراك باش بجوونو پەلە نەکەن لە خواردندا، لای خۆشمان چەند پەندێك ئامۆژگاری خۆپارێزیمان لە خواردن لێدەکات وەکو (گەدە، ماڵی دەردە) یان (سێیەکی گەدە بۆ خۆراکە، سێیەکی بۆ ئاو، سێیەکی بۆ هەوا). ئەم ئامۆژگاریانە خۆپارێزی پزیشکیی نوێ لە لایەنی دەروونیەوە پشتگیری لێدەکات.

هەندێ کەلتوور باس لە ئازادی منداڵ دەکەن لە هەڵبژاردنی جۆری یارییەکانی، وردبوونەوەو فێربوونو ڕەهاکردنی وزە چەپێنراوەکانی، کەلتووری تر هەن منداڵ ناچار دەکەن بەرەنگاری ژیان بێتەوەو بچێتە مەیدانی تێکۆشانەوە بێ ئەوەی بواری یاریکردنی پێبدرێ، ئەمەش منداڵ تووشی نەخۆشییە دەروونیو دەمارییەکان دەکات، گەشەکردنی لە سێبەری کەشێکی دەروونی ڕەوادا

ئەخاتــە مەترســـییەوە، هـــەروەها لـــە قۆنـــاغی شـیرەخۆرەو قۆنـاغی بڕینــەوە لـە مـەمك. لەگـەڵ شێوازو ئامرازەکانی کۆنترۆڵ کردندا.. هتد بە هەمان شێوەیە.

زۆر کۆمەڵگـە هـەن پاڕانـەوە لـە ڕەفتارەکانیانـدا پەسـەند دەکـەن ئـەویش بـە شـێوازی جـادووکردن، نووشتەکردن، بـەردی پـیرۆز، هـەڵم کـردنو سـرووتی ئـاینی هـەروەها کەرەسـتەی تـر بـەکاردەهێنن وەکـو شـێوازی خۆپاراسـتن لـە نەخۆشـی. هەنـدێ لـەو شێوازانە لە ڕووی بـەدیهێنانی فرمانـەکانی ئـۆقرەیی دەروونیەوەیە، بەڵام زۆرجار نووشدارو نـەخۆش لـە هەمبـەر تێگەیشـتن لـە هۆکـارە ڕاسـتەقینەکانی نەخۆشو دەستنیشانکردنی نەخۆشی دەستەوستانو هەڵخەڵەتاون.

بـۆ هـەموو کـەلتوورەکان، کەرەسـتەی خۆپـارێزی ئامـادە کـراوە، هـەروەها بـۆ بـەڕێوەبردنی هـەموو لایەنـەکانی کەسـێتی مرۆڤایـەتی لەسـەر ئاسـتی تەندروسـتی دەروونـی، کـەشو هـەوای دەروونـی بـۆ لابردنـی پاڵنـەرە چـەپێنراوەکان، فەراهـەم کـراوە، لەوانە مۆسیقا، گەمە وەرزشییەکان، بەخت گرتنەوە، ئاهەنگی بۆنەکان، سـرووتی قوربـانی، ڕۆشـنگەری بـە

هــەموو سیســتەمو دەزگاکانیــەوە، بــە کەرەســتەی پەســـەندکراوی ئامانجـــدار بـــۆ بەدەســـتهێنانی کاڵکردنــەوەی ڕاڕایــیو بەرتەســك کردنــەوەی لــەو سـنوورەی کـە چوارچـێوەو چـەمکە کۆمەڵگەییـەکان نەخشەیان بۆ کێشاوە.

یاساو ڕێسا ئایینیەکان بە پاداشتو سزا دونیاییو ئـەو دونیاییەکانیـەوە، بـە ئامۆژگارییـەکانی کـە لـە خانــەی پەرســتگای ئاییـنــە جۆربەجۆرەکانــەوە بــۆ خۆشویســـتنی خـــەڵكو سیســـتەمو کـــارکردن بـــۆ ئــۆقرەییو کــاری چــاکە، بــە گــوێی خەڵکیــدا داوە، هـەروەها جەختکردنـەوە لەسـەر ئـەو بیروباوەڕانـەی کــە هەڕەشــە ئــامێزن، ســزای کۆتــایی، باســکردنی پاداشـتی ئـەو دونیـا لەسـەر کـاری چاکەو بونیادنـەر، هــەموو ئەمانــە کاریگەرییــەکی گــەورەی لەســەر بەدەستهێنانی کۆنترۆڵکردنو ئەو ئاراستانە هەیە کـە تەندروستی دەروونی لای تاکو کۆمەڵ مسۆگەر دەکات کە خۆی لە قەڵغانی خۆپاراستندا دەبینێتەوە.

بەڵام ئەم پێوەندییە ئەنثرۆپۆلۆجیـە پزیشـکییە ڕۆڵی لە تۆژینەوەی لایەنی خۆپـارێزی لـە کـەلتووردا چــییە؟ لــە بەشــی ڕابــووردوودا وتمــان، ئــەرکی ســـایکۆلۆژی پزیشـــکی تۆژینـــەوەی نەخۆشـــیو

بیروباوەڕە پزیشکییەکانە لە ڕووی —خۆپاراستن‌و چارەسەرکردن-ەوە، مومارەسە میللییەکان لە سیاقی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا. بەوە گرنگیدان بە نەریتە کۆمەڵایەتییەکان لەم بارەیەوە بۆ گەشەپێدانی زانیاری خەڵك سەبارەت بە باری تەندروستییان‌و هۆکاری نەخۆشییەکانیان‌و شێوازی پارێزگاری لە خودی خۆیان تاکو بنەمای (خۆپاراستن لە چارەسەرکردن، باشترە) بەدەست بێت‌و لەبەر ڕووناکی ئەو بنەمایە بچەسپێت.

**٢-لایەنی چارەسەرکردن لە تۆژینەوەی ئەنترۆپۆلۆژیای پزیشکیدا:**

بە حوکمی ئەو تێکەڵبوونە ڕوونەی لە نێوان لایەنی چارەسەری‌و خۆپارێزیدا هەیە، قسەکردن لەسەر لایەنی چارەسەری، ئەو بەردەوامییە دەنوێنێ کە خۆی لە لایەنی خۆپارێزی جیانەکاتەوە، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا. لایەنی چارەسەری کە باسی دەکەین لەو شێوازانەدا خۆی دەبینێتەوە کە بەکاردێت بۆ لابردنی ئازار یان پەشێوییە دەروونی‌و زەینییەکان‌و گێڕانەوەی نەخۆش بۆ باری تەندروستی سروشتی، کە ئەمیش دەرمان‌و کاری پزیشکی دەگرێتەوە، کە جادووکردن، نووشتە،

سرووت خوێندن، ئەستێرناسییو بتەکان دەگرێتەوە. گــەلانی تەقلیــدی لــە ڕێــورەسمی هــەڵم کــردنو پاکژکردنــەوەو گۆزیـان بـەکارهێناوە، کرمـی زەروو و داخکردنو شێلانو شێوازی تری لەو جۆرەیان پێڕەو کردووە.

هـەروەها نەشـتەرگەری کـە پـێش هـەزاران سـاڵ ناسراوەو دەیناسێ، هەندێ گەلانی تەقلیـدی پێڕەوی دەکەن، هەروەها گیراوەو مەرهەمی ئامادەکراویـان لـە گـژوگیاو تـۆو کەرەسـتەی چارەسـەرکردنی تـر کـە ئەزبەر کراوەو دەماودەم (بـە کەلـەپوری زارەکـی) بـۆ خـەڵکانی تـر گواسـتیانەتەوە کـە ئـەویش خـۆی لـە نـەریتی کۆمەڵایـەتیو ئـەدەبی میللیـدا دەبینێتـەوە. بەڵام ئەو زانیاریانە تەنها چەند کەسێك بـۆ خۆیـان قۆرخیان کردووەو کاری پێدەکەنو، وەکو پیشـەیەکی تایبــەت پێویســتی بــە دەســتڕەنگینی یــان شــێوازی هونـەری ئـاڵۆز هەیـە، بـەڵام ئـەوەی ئاسـانە خـەڵکی ڕەشۆکیش پێی هەڵدەستن(٥١).

هـەروەکو پێشـتر ئاماژەمـان پێـدا کەرەسـتەکانی چارەسـەرکردن بـە تێگەیشـتنی خەڵکـەوە بەسـتراوە، بـوونی پەیوەنـدی پتـەو لـە نێـوان چارەسـەرکردنو توخمـەکانی بـاوەڕو نەریتـە کۆمەڵایەتییـەکانی تـر

وەكو كاری جادووكردن (بۆ نموونە) هەیە. هەندێ نەخۆشی وا لێكدەدرێتەوە، هۆیەكی سیحری لە پشتە، لەبەرئەوە بە رێورەسمی سیحریش چاك دەبێتەوە، یان هۆكاری سرووشتی لە پشتە، بۆ ئەو مەبەستە لە میانەی تێبینیو ئەزموونی ساڵەهای ساڵ بە بینێكی درێژەوە خۆی ئامادەكردووە تاكو چارەسەرێك بدۆزێتەوە كە لە سرووشتەوە (ڕووەكو گیانەوەرو تەنی ڕەق) وەریگرتووە. كەلتووریش كاری چارەسەركردنی بۆ نەهێشتنی ڕوودانی باری دەروونی تەوزیف كردووەو پشتی پێبەستووە، پێی وایە كۆمەڵ ئەم نەخۆشییە بە شایستە نازانێ یان بۆ چارەكردنی ئەم بارە كاردەكات. ڕێگەچارەی ئەم بارانە تەنها كەرەستە كەلتوورییەكانە، ئەركێكی وابەستەیە بە پێكهاتە كەلتووریو وەزیفییەكانەوە. لەو كەرەستانەش[٥٢]:

### ١-فاكتەری دڵنەوایی.

هەندێ جار كەلتوورەكان كەشی حەوانەوەو دڵنەوایی Recreative بە شێوەی وەرزی بە سازدانی بۆنەی دیاریكراو، ئەرەخسێنێ كە ڕێگە بە تاكەكان ئەدات، گوزارشت لە ئارەزووەكانیان بكەن تاكو

پشوویەکی دەروونی بدەن، جگە لەو بۆنانە ناتوانن گوزارشت لەو کەشی وچانە، بۆ پاڵنەرە چەپێنراوەکانیان بکەن کە چەند شێوەیەکی هەمەجۆر لەخۆ دەگرێ هەندێکیان بە شێوەی هەڵکشان (Sublimation)[٥٣] دەردەکەوێ لەگەڵ کۆنترۆڵکردنی پاڵنەرە جەستەییەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بەشێکی بەرفرەوانی ئەم کەرەستانە خاوەن سرووشتێکی زاخاو ڕێژن، وچانێك بە دەروون دەدەن وەکو مۆسیقا، نواندن، وێنەکێشان، وەرزش و چالاکیی گەشتکردن و ئاهەنگ و سرووتە جیاوازەکان.. هتد، ئەمانە شێوازی تێرکردنی- چارەسەرییە بەشداری تێرکردنی ئەو پاڵنەرە دەکات کە ڕازی ناکرێ، ئەو ڕاستیە دەردەخات کە کەشێکی گونجاو لە هەلومەرجێکی ڕۆژانەی ئاساییدا فەراهەم دەکات تاکو مرۆڤ بکارێ خۆی بە پیادەکردنی ڕۆڵە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانەوە لەناو پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا، سەرگەرم بکات.

**٢-دامەزراوەی کۆمەڵایەتی(٥٤):**

ئەو ئامرازە پەسەندکراوانەیە، کە ئامانجی بەرتەسککردنەوەی ڕاڕایی‌و کەمکردنەوەیەتی، بە جۆرێك کە ئەم ڕاڕاییە نەتوانێ هەڕەشە لە یەکێتی کۆمەڵگەو سەقامگیری‌و ئۆقرەیی بکات. ئەم دامەزراوانە وەکو بەدیلێك بۆ ئەو ڕاڕاییە نەخۆشییانە دێتە ناوەوە کە ئەبنە هۆی لەدەستدانی کەسێتی لە پیادەکردنی ڕۆڵەکانی لەناو کۆمەڵدا. هەروەها تووشی حاڵەتی تاوگیری‌و دڵەڕاوکەی دەکات‌و دواتر ئەبێتە هۆی نەخۆشی دەمارگیری، بەوەش سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەکەوێتە بەر هەڕەشەو داڕووخانی نوێ دەستپێدەکات وەکو لە بزاوتە ڕۆحی‌و غەیبییەکان دەکەوێتەوە، ئەو بزاوتانەی کە ئامانجیان گۆڕینی واقیعە لە میانەی توندڕەوییەوە.

کەمایەتییە عرقییەکان لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا یان لە ژینگەی کۆمەڵایەتی- کەلتووری کە تێکەڵ بە کۆمەڵگەی نامۆو نیشتەجێ بوو لە خاکەکەیدا دەبن، پشت بە زۆرێك لە دامەزراوە کۆمەڵایەتی- ئەهلییەکان دەبەستێ کە ناوەڕۆکی ڕۆحی‌و غەیبی

تیا بەدی ئەکرێ وەکو (شامانی، ڕێگەی سیحرئامێزی جیاواز، هەندێ سرووتو مەراسیمی ڕۆحی).

ئەم کەمایەتیانە ناچار دەبن بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەنگژە دەروونیەکانو کەمکردنەوەی باری دڵەڕاوکەو هەستکردن بە نائومێدیو ورەبەردان، پەنا ببەنە بەر شێوازی سروشتی هەڵچوونو تاوگیری سۆزداریی بەهێز کە کەلەپوورو کۆمەڵ ڕێگەی پێداون، وەکو سەمای شێت ئامێزی هستیریو گۆرانی پڕ هاوارو قیژە.

### ٣-شێوازی ستراتیژی بۆ کۆنترۆڵکردن:

ئەم شێوازە بە ڕێگەی سرووتە دەستەگەلییەکانەوە پابەندە، کە پشتگیری لە پێداگرتن لەسەر ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانە دەکاتەوەو ئاگایی دوورکەوتنەوە لە ئاراستە داوەشینەکان دەکات، هەروەکو لەو خوتبە ڕوحیو ئەخلاقیانەدا دەوترێنەوە، مرۆڤ ئاگادار دەکاتەوە پەلاماردەرو شەڕەنگێز نەبێت، سیستەمو خەڵکیان خۆشبوێ، کار لەسەر ئاسایشو کاری چاکە بکەن، بەڵگە لەسەر ئەوە جەختکردنەوەیە لەسەر ئەو بیروبۆچوونانەی کە هەڕەشەی سزای دواڕۆژو

پاداشت لەسەر کاری چاکەو خێرو بابەتی ئامۆژگاریو هاندانی ڕۆحیو ئەخلاقی لەخۆ گرتووە، ئەم شێوازانەو نموونەی لەو جۆرە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە بۆ دابینکردنی کۆنترۆڵکردن هەروەها تەمبێ کردنی تاکە شەڕەنگێزو دەروون نەخۆشەکان، کە شێوازی هەڕەشەکردنە بە سزای دواڕۆژ، ئەم شێوازە ئاراستەکراوە، کاریگەریی دەروونی چارەسەریشی لای تاکە ناچوون یەکەکان هەیە، چونکە توخمە زەینییە هەمەجۆرەکان لەوانە خودی باڵا Supereqo[٥٥] لە کەسێتی تاکە دوودڵەکانو بەهێزکردنی هەستکردنی خود لە بەرپرسیارێتی، لا دروست دەکا.

ڕۆڵی مرۆناسیی پزیشکی لە بواری چارەسەرکرندا بەم جۆرە دەرئەبڕین:

١-مومارەسەو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان لە دەروونی خەڵکدا جێگەو ئاراستەیەکیان لە چارەسەری هەندێ نیشانەو نەخۆشیدا هەیە کە مرۆڤ تووشی دەبێ. باشترین بەڵگە لەسەر ئەوە هەندێ لەو نەریتانە بەهرەو دانراوی ئەدەبی پەند ئامێزیان سەبارەت بە کاروبارە میللییەکان هەیە،

لەوانە چارەسەری میللی، جادووکردن، وەرگرتنی ڕای دەوروبەر، بۆ سەرکەوتووترین چارەسەری نزیك.

کەواتــە کــارلێکی تــەواو لــە نێــوان ئــارەزووی نــــەخۆش بــــۆ چارەســــەرکردنو نەریتــــە کۆمەڵایەتییەکاندا هەیـە کـە لـە بیروبـاوەڕە میللییـە باوەکانەوە سەریهەڵداوە.

٢-هەنـدێ لـەو بـاوەڕو پـراکتیزانـە بـە ئـامرازی چارەسـەریی سـەرکەوتوو دائـەنرێن، بـە تایبـەتی لـە چارەســەرکردنی هەنــدێ نەخۆشــی ســادە وەکــو ئارامبەخشی دەروونی.

٣-دۆزینەوەی ئـەم مومارەسـەو بـاوەڕە میللییانـەو ئاراستەکردنیان بە شێوەی ڕاستو دروستو هەوڵدان بۆ لابردنی ئـەو نەریتـە کۆمەڵایەتییـە ناشایستانەی ئەبنــە هــۆی ئــەو نەخۆشــیانە ئــەرکی سەرشــانی مرۆڤناســە پزیشــکییەکانە، لــە ڕێگــەی تۆژینــەوەی نێـوان کەرەسـتەکانی چارەسـەری خۆمـاڵیو چـەمکی نەخۆشــــی کــــە لــــە شــــێوازە کــــەلتووریو عەقیدەییەکانەوە سەریهەڵداوە کە کردەوەو چالاکیو چەمکە باوەکان بـە دەوریـدا ئەسـووڕێنەوە، تـاکو بـە پێــی شــێوازەکانی خۆپاراســتنو چارەســەرکردن لــە لایەن (مەبەستدارێتی) کۆمەڵگەوە سنووردار بکرێت.

٤-تێگەیشتن لەم فاکتەرانە بە (گەیشتەو دەرهاویشتەوە) بوار لە بەردەم نەخشەدانەری تەندروستی گشتی خۆشدەکات، چاودێری تۆژینەوەی مرۆناسییە پزیشکییەکان بکات، کە ئاسانکاری لە پراکتیزەکردنی ئەم نەخشانەدا دەکات‌و سەرکەوتن بەدەست دێنێ‌و هاریکاری‌و سەرخستنی هەموو هەوڵە دیاریکراوەکان لە ئەستۆ دەگرێ، تاکو مەبەستەکانی لە گەشەسەندنی کۆمەڵگەو خۆشگوزەرانی مرۆڤدا بەدەستبێنێ.

## بەشی سێیەم

## دیدگای ئەنترۆپۆلۆژی بۆ تەندروستیو نەخۆشی

دیدی ئەنترۆپۆلۆجی بۆ تەندروستیو نەخۆشی لە سیاقە ئیکۆلۆجیو کەلتووریو کۆمەلایەتیەکەیەوە، وەکو فاکتەرێکی کارا لە دیاریکردنی واقعی تەندروستی کۆمەڵەکانو گەلان باسی لێوە دەکرێ.

ئاراستەی ئەنترۆپۆلۆژی بە شیتەلکردنی وردی پێکهاتە ژینگەییو کەلتوورە کۆمەلایەتییەکان (نەریتو بەهاکان) و مومارەسەی تایبەتی ڕەوشتی تاك کە ملکەچی ئەوانە، کۆتایی دێ. هەروەها پێوەندی هەموو ئەمانە بە کارلێکی سروشتی نێوان خەلك- تاکو کۆمەڵو ژینگەی سروشتی، و کاریگەریی لەسەر تەندروستیان لە ڕووی جەستەییو دەروونیو زەینییەوە[٥٦] کە پێشتر بە وردی لە هەردوو بەشی ڕابردوودا لێی دواین، بەهێزە. ڕۆشنگەری ڕۆڵی دیاری لە بەخشینی مانای دیاردەو شتەکان هەیە، لەوانە تێگەیشتن لە تەندروستیو نەخۆشیو

چارەسەرکردن بە پێی باوەڕە کەلتوورییە کۆمەڵایەتییە ڕێکخراوو زیندە چالاکییەکان کە زانستی فاکتەری ناوەند (عامل الوسیط) ئەسەپێنێ کە خۆی لە نێوان نەخۆشی (کە پێویستە چارەسەر بکرێ) لەگەڵ ڕەوشتی مرۆڤ، کە فێر ئەکرێ چۆن بەرگری لە نەخۆشی بکات[٥٧]. ئەم فاکتەرە بە ئاراستە کۆمەڵایەتییەکان دەناسرێت[٥٨].

ئاراستەو شێوازە چارەسەرییەکان وەکو توخمەکانی کەلتوور:

ئەو کۆمەڵەی کە نەخۆشییەك لە نەخۆشییکان یان پەتایەك لە پەتاکانی تێدا بڵاودەبێتەوە، ئاراستە کۆمەڵییەك لەنێو خۆیاندا، بەرەو ڕووی ئەو نەخۆشییە، یان پەتایە، دروست دەکەن. ئەم ئاراستەیەش بەندە بە شارەزایی کەڵەکە بوو و کارتێکردنە کەلتورییەکانەوە. بەڵام بزاوتە جووڵەکەی لە بەرەنجامی هەڵوێستەوە وەردەگرێ، کۆمەڵو گرووپەکان شوێن شێوازە ڕەوشتیەکان دەکەونو کۆمەڵگە خۆی پێدەناسێنێ تاکو ئەبێتە بەشێك لە کەلتوورەکەی[٥٩]. مرۆڤ هەر لە سەروبەندی دروست بوونیەوە لەسەر زەوی تووشی نەخۆشیەکان بووە، بۆیە بەرامبەر بە وێستگە

مەترسییدارەکان کە هەڕەشەی لە تاکو کۆی کۆمەڵەکەی کردووەو کەلتوورەکەی خستۆتە مەترسییەوە، بە تایبەتی بە بڵاوبوونەوەی پەتاو درمەکان، لەبەر ئەوە کەلتوورو کۆمەڵگەکانی کەرەستەکانی خۆیان بۆ بەرەنگاری ئەم مەترسییە خستۆتە گەڕ بۆ وەستاندنی یان چارەسەرکردنی یان خۆپاراستن لێی. گرنگترین شێوازەکانی دەرمانو جادووگەری بووە، بۆیە کەلتوورەکان دۆزینەوەو گەشەپێدانی شێوەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشیدا خستە بەرچاو، ئەویش بە کاری نوژداری ناسراوە. مومارەسەی نوشداریو شێوازەکانی بەشێکە لە کەلتوور لەهەر کۆمەڵێکدا[٦٠].

کەلتوور دەستکەوتێکە بۆ تاکەکان، لە بەشێك لە ڕەوشتەکان پێکدێ کە تاکەکانی کۆمەڵە کەلتوورییەکان فێری دەبێو بەشداری تێدا دەکات، ئەوەی لە چارەسەری ئامادە بۆ کێشەکانمان پێشکەشی دەکات ڕۆڵی خۆی لە ڕێکخستنی هەر گۆشەیەك لە لایەنەکانی ژیانمان دەبینێ، هەروەها جۆرە ڕەوشتێکە پێشینەکان دایانهێناوە[٦١] و لەناویاندا ئاراستەو شێوازەکان لەگەڵ نەخۆشیدا مامەڵە دەکەن، بنەما کەلتوورییەکان سەرچاوەیان لە

ئاراستەکردنی ئەم ئاراستە و شێوازانە هەیە بەوەی کۆمەڵ لەسەری کۆکەو نەوەکان بە ئەزموونو هەوڵدانو زانیاری خۆیان بە ماوەیەکی درێژخایەن کۆیان کردۆتەوەو لە ئەنجامی واقیعە ئیکۆلۆجیو مرۆڤایەتیەکانەوە بۆ ئەم مەبەستە وەریان گرتووە.

## زانستی پزیشکی چۆن بۆ مرۆڤ ئامادەکراوە؟

دوای ماوەیەکی زۆرو ئەزموونێکی تاڵو شارەزاییکی کەڵەکەبوو مرۆڤ درکی بەوە کرد، کە فاکتەری جیاواز بۆ حاڵەتەکانی نەخۆشی هەیە کە تووشی مرۆڤ دەبێت. لەو فاکتەرانەش، فاکتەری سرووشتی، ڕۆڵێکی دیاری هەیە وەکو قرچەی گەرماو سەرمای جگەربڕ یان بە هۆی جیاوازی کتوپڕ لە نێوانیاندا، دروست دەبێ.

هەندێ جار هۆکارەکانی خۆراکی یان ژیاری، یان ژاراوی بوونە، یان بە هۆی تووشبوونی مرۆڤ بە هەندێ ڕووداوی کتوپڕ وەکو شکاوی، برین، سوتاویو شتی تر[٦٣] هەندێ جاریش هۆکارەکان نادیارنو هەستیان پێناکرێت، ئەیگێڕنەوە بۆ هێزە

غەیبیەکان، سزا ئەدرێ یان تووشی بەڵای دەکا، یان بە گوێرەی دیدگای دونیایی تۆڵەی لێدەکاتەوە[٦٣] تێگەیشتنی بۆ نەخۆشی، جۆرەکانی بیرکردنەوەی پەیوەست بە دیاردەو هۆکانی نەخۆشی، ناسینەوەی ئەو ڕووداوانەیە کە لە ژینگەیەکی کەلتووری دیاریکراودا ئەدرێتە پاڵ دونیای نەخۆشی، لە ژینگەیەکی کەلتوری دیاریکراودا، گوایە توخمی کۆمەڵایەتی ڕۆژانەن، نەك فیکرو بیروباوەڕە نادیارەکان کە بە باڵای شارەزاو پسپۆڕەکاندا براون[٦٤].

چەمکی نەخۆشی (وەکو پێیدا ڕەت بووین) جگە لە بەشێك لە وەسیلەکانی چارەسەرکردنی کە ماناو دەلالەتەکانی لە پێوەندی نێوان نەخۆشیو پێکهاتەی کۆمەڵایەتی وەردەگرێ، شتی تر نییە. بەوەش نەخۆشی لەگەڵ سیستەمی کۆمەڵایەتیدا یەکدەگرێ، ناتوانین وەکو دیاردەیەکی ژیاری- سرووشتی لە تۆژینەوە دایبڕین، بەڵکو دوای فاکتەرە کۆمەڵایەتیو کەلتوورییەکەشی دەکەوێت.

مرۆڤی سەرەتایی هەوڵیدا ڕزگاری ببێ لەو نەخۆشییەی تووشی دێت یان بە برینداری پەکی دەکەوێت، یان ئازارێك پەکی دەخات، بۆیە هەوڵی

زۆری دا ئەوەی لە خاك بەردەستی دەكەوێ لە خۆڵ یان ڕووەك یان پاشەڕۆی گیانەوەر بە كاری بێنی، ئەمە سەرەتای كاری پزیشكیو چارەسەر بوو یان ئەكرێ بڵێین مەعریفەی نووشداری[٦٥]. نەخۆشی تا چەند سەدەیەك كارێكی نادیار بوو ئەنجا بە چارەسەری جادووگەریو ئەفسانەوە بەسترایەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا شێوازی ئەقڵانی بە پێی ئاسۆ مرۆڤایەتییەكەی لە چوارچێوەی زانستی ئەو دەمەدا ڕێگر نەبوو. بەڵام برینو ئەنگاوتنەكان لە كۆندا بە جۆرێك لە جۆرەكان بە ڕێگای ماقووڵ چارەسەر دەكران وەكو (تربنة)[٦٦]. بۆ هەندێ مەبەستی چارەسەركردن پشتیان بە ڕووەك بەستووە، بەڵام جادووگەری بۆ ئەو نەخۆشیانە پێڕەو كراوە كە هۆیەكەی نەزانراو بووە[٦٧]. لە كۆمەڵی شێوازە فیكریو مومارەسە پزیشكییەكاندا ڕیتمێكی پزیشكی بۆ مرۆڤ ئامادەكراوە، پەیوەندی بەو نەخۆشییانەوە هەیە كە مرۆڤ تووشیان دەبێ[٦٨]. ئەم ڕیتمەش لەگەڵ ڕیتمەكانی پێكهاتە كۆمەڵایەتییەكاندا بۆ هەر كۆمەڵگەیەك بە پێی كەلتووری ئەو كۆمەڵگەیە یەكانگیر دەبێتەوەو سەرجەمگیری كارلێكی لەگەڵ دەكات.

## سەرەتاکانی گرنگیدان بە پزیشکی میللی لە ڕووی ئەنترۆپۆلۆژییەوە

زانای بەریتانی (ڕیفرز) لە کتێبی (نوژداری)، یان (پزیشکی میللی)، یەکەم کەس بوو لەسەر باوەڕی مومارەسە نوژدارییەکان لەنێو گەلانی دواکەوتەو نەخوێندەواردا نووسیو ڕێبەری کردنی بەستنەوەی نوژداری بە لایەنەکانی وەکو کەلتوورو سیستەمی کۆمەلآیەتی گرتە ئەستۆ[٦٩]. گرنگیدان بەم چەشنە پزیشکیە بەو بابەتە گرنگانە دائەنرێ، کە مرۆناسەکان کاتێکی زۆریان بۆ تەرخان کردو لەو کۆمەڵە تەقلیدییانەشدا ئەرکەکانیان پیادە کرد کە نوژداری میللی تێدا بلاوە[٧٠] بەوەش مەعریفە سەرەتاییەکانی مرۆڤی سەرەتایی لە تەوزیف کردنی سەرچاوە مەعریفیو ژینگەییەکاندا، کەڵکی وەرگرتو کەرەستە پشت پێبەستراوەکانیش شێوەکانی خۆی لە سەرچاوە کانزاییو ڕووەکیو گیانەوەرییەکانو سرووتە ڕۆجییەکان کە شوێنەواری دەروونی لەسەر مرۆڤ جێدێڵێ بەشداری لە مومارەسە چارەسەریو خۆپارێزییەکان دەکات، بە

کورتی مەبەست لە چارەسەرکردن یان پزیشکی میللی، ئەو شێوازانەیە کە کۆمەڵە دواکەوتوو و نەخوێندەوارەکانو کۆمەڵگا تەقلیدییەکان پشتی پێدەبەستن، لەسەر ئەو بنەمایەکاری لەسەر دەکەن، کە موژدەی چاکبوونەوەی لە خۆگرتووە، بێ ئەوەی هیچ کاریگەرییەکی لابەلای لەسەر لەش هەبێ. زۆر ڕاچێتەی جیاواز لای ئەم گەلانە هەیە. لە شێوەی مەرهەمو گیراوە، هەندێ جار کرداری نەشتەرگەرییش بە شێوەی ساکارو سەرەتایی لەو دەمەدا بە ئەنجام گەیشتووە. نوژداری، وەکو تۆژینەوە ئەتنۆگرافییکان باسی دەکەن، زۆر جار ئەنجامی باشی بەدەستهێناوە، لای هەندێ کەلتوورو کۆمەڵگەی شارستانی (وەك چینییەکان، هیندییە سوورەکان، دانیشتوانی دورگەی کینیای نوێ)، ڕەسیدێکی گەورەیان لە کاری نوژداری[٧١] لا کەڵەکە بووە.

ئەگەر نوژداری نوێ لە کۆمەڵگە تازە پێگەیشتووەکاندا شوێن پێی خۆی کردبێتەوە، ئەوا مرۆناسەکانیش بۆ ماوەیەکی درێژخایەن گرنگیان بە لایەنی نوشداری ئەدا بێ ڕەچاوکردنی لایەنی ڕەسمی. ئەم لایەنە وەکو بابەتێکی بنەڕەتی بوونی

بابـــەتی تایبەتمەنـــدی مرۆناســـە پزیشـــکیەکان، هەرچـــەندە گرنگیشـــیان بـــە پراکتیکـــە نوێیـــەکانی پزیشـــکیو دامـــەزراوە پزیشـــکییەکانی کۆمەڵگـــە نوێییـــەکان ئـــەدا. هـــیچ کـــەلتوورێك لـــە کـــەلتوورەکان نییە، توخمەکانی پزیشکی میللی (نوژداری)یان لەخۆ نـــەگرتبێ، جیـــاوازی نێـــوان ئـــەم کۆمەڵگەیانـــەش مەســـەلەیەکی ڕێژەییـــە. کۆمەڵگـــە هاوچـــەرخەکان زیـــاتر پشـــت ئەســـتوورن بـــە پزیشـــکی نوێـــوە، کـــەمتر باوەڕیان بە کاری نـــوژداری هەیـــە بـــە پێچەوانەشـــەوە ڕاســـتە. بـــەڵکو گەڕانەوەیـــەك هەیـــە بـــۆ پزیشـــکی دەوەنو گـــژوگیاو تیمـــارکردن بـــە بەرهـــەمی سروشـــتی لە ژینگەدا، وەکو مرۆڤ پێش گەیشـــتنی بـــە پزیشـــکیی نوێ بە کاری ئەهێنا، بەڵام دیدی کۆمەڵگەی نـــوێ بـــۆ ئـــەم شـــێوازە ئەوەیـــە، بـــە شـــێوازێکی دواکـــەوتوو مامەڵـــەی لەگـــەڵ دەکـــات[٧٣]. ڕەنگـــە ئـــەم گەڕانەوەیـــە لەســـەر ڕووی لاپـــەڕەو گۆڤارەکـــان بـــەدیی بکـــەین، ئـــەویش بـــە دەرخســـتنی بـــوارو تایبەتمەنـــدیی چارەسەرکردن بۆ هەندێ لەو گژوگیاو تیمارکردنانە، لـــە دەروازەی ئەزموونگەرییـــەوە. ئـــەم واقعـــە وای لـــە زانایەکی وەکو (ئەکیرکخت) کە یەکێکە لـــە دیـــارترین ئـــەو کەســـانەی کـــە لـــە بـــواری مرۆناســـیی پزیشـــکیدا

کاریکردووە بڵێ "ئێستا تۆژینەوەیەکی بەراوردکاری گەورە ئەکرێ بۆ نوژداریی سەرەتایی کە بەهایەکی گەورەی بۆ سەر مێژووی نوژداریو دەردەکان بە گشتی هەیە[٧٣].

بە کردەوەش، هەندێ لە پسپۆڕانی کایە پزیشکیو دەرمانسازییەکانیش ئەو ئەرکەیان گرتە ئەستۆی خۆیان لە شێوازەکانیو مادە چارەسەرییە چالاكو بێزیانەکان، لە بەرهەمە پیشەسازییەکان – دەرمانو گیراوەکان- کە هەندێکیان زیانی لاوەکیو کاریگەریی لابەلای بۆ سەر نەخۆش هەیە. هەروەها نائومێدبوونی هەندێ لە تاقیگەکان لە دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ هەندێ لە نەخۆشییەکان. ئەوەش وای خواست بە دوای تاقیکردنەوەی گەلاندا بچین، لەوەی کە تۆژەرەکان ڕەنێویان هێناوەو لە موماره‌سەو شارەزاییان سوودمەند بوونە. ئەم گەڕانەوەیە، کە تۆژینەوەی بەراوردکاری لەسەر کراوە، بیرۆکەکەی (ئەکیرکخت) بەسەرماندا ئەسەپێنێ سەبارەت بە نوشداری سەرەتایی (میللی تەقلیدی) تاکو لە تێگەیشتنو پێودانگی خۆمان دوورکەوینەوە[٧٤] ئەمەش دامالینی بەهاو میتۆدە بابەتییەکانو دیدگا ڕێژەییەکە، ئەسەپێنێ تاکو

لەگـــــەڵ ســـــیاقە ئیکۆلـــۆجیو کۆمەڵایـــــەتیو کەلتوورییەکــە بگــونجێ کــە دەســـەڵاتی بەســـەر مومارەســە پزیشــکییەکاندا ئەشــکێو ئاراســتە یــان پێشکەشی دەکات.

## چۆن لە نوژداری دەگەین؟

ڕەنگە دیارترین پێودانگی پێویست بۆ تێگەیشتن لـە نـوژداری، گەڕانــەوە بـێ بـۆ چـەمکی کۆمەڵگـەو کەلتوورەکەی کە تەندروستیو نەخۆشـی لـە هـەناوی خۆیدا هەڵدەگرێ، لێرەدا نموونەیەکی (ڕیفرز) کە لە ســێ کۆمەڵــە مەســـەلە دەدوێ دێنینـــەوە، ئـــەو گۆڕانکارییەی سەبارەت بە ڕەوشت ڕەچاوی کـردووە، بــە تایبــەتی ڕەوشــتی کۆمەڵــە تەقلیدییــەکان لــە بەرەنگاربوونـــــــەوەی نەخۆشـــــــیدا. بـــــــەڵام گۆڕانکارییەکانی ئایینده[٧٥] پێی وایە تەنها ئاراستەی کۆمەڵــە بــەرەو جیهــان یــان دیــدگای بوونــەوەری (المنظـور الكـوني)[٧٦]. ڕیفـرز لـە هـەوڵی ئەوەدایـە هەرسێ دیدە بوونەوەرییەکـە لێـك جیابکاتـەوە، لـە بەرامبەر هەریەکەشیان باس لـە شـێوازی ڕەوشـت لـە بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشیدا بکات، بەم جۆرە[٧٧]:

١-دیدی جادووبازی: ئەم بۆچوونە پێی وایە نەخۆشی بەرهەمی کردەوە جادووییەکانە، هەندێ کەس پێیان وایە هێندە نادیارەکان (غیبی) بڵاوی دەکەنەوە، بۆیە تەنها بە جادووگەری و بەختگرتنەوە، بەرەنگاری نەخۆشی دەبێتەوە.

٢-دیدی ئایینی: ئەم باوەڕە پێی وایە هێزە رۆحی و نادیارەکان، فاکتەری کتوپڕن بۆ نەخۆشییەکان، بە مومارەسە ئەخلاقی و ئاینییەکانیش ڕازی دەکرێن.

٣-دیدی سرووشتی: ئەم دیدە وای دەبینێ فاکتەرە سرووشتییەکان هۆکاری نەخۆشین، پەیوەندی هۆکاری لە نێوان دیاردە سرووشتییەکان و ڕوودانی نەخۆشیدا (ناوەکی و دەرەکی) هەیە، بە ڕەوشت و مومارەسە چارەسەر دەکرێ، ئامرازەکانی مومارەسەش پشت ئەستوورن بە چارەسەری دەرمانی و گیراوەو ڕاچێتە سرووشتییەکان بۆ ئەو نەخۆشی و کۆسپانە. لەسەر ئەو بنەمایە ئەبینین تێکەڵکردنێك لە نێوان هەموو قۆناغەکان بۆ ئەم ئاراستانە بوونی هەیە، بە واتایەکی تر، تێکچڕژانی چەمك و لێکدانەوەو ڕەوشت و مومارەسە ئاراستەکراوەکان بۆ چارەسەرکردن و خۆپارێزی،

لێرەدا پێڕەوکراوە، جادووگەر لەگەڵ پیاوی ئایینی، ئایین لەگەڵ سروشت، ڕەنگە لە کەلتووری کۆمەڵگەی خۆماندا بۆ نەخۆشیو باوەڕەکانی ئەو نیشانەیەمان پێکابێ کە دەڵێ، بەڵاو ئاشووبیی، خوا بە سەرمانیدا ئەدات (نبلوكم الخير والشر، فتنه) ئایەتی قورئانی پیرۆز، هەروەها فاکتەرە سرووشتیو ژیارییەکان بۆ تووشبوون بە دەردو نەخۆشی وەکو هۆکاری ڕاستەوخۆ بوونی هەیە. بەڵام باوەڕکردن بە جادووگەری چارەسەرو لێکدانەوەی بە جۆرێکە گوایە دەستی ڕەشی هێزە غەیبییەکان وەکو جنۆکەو گیانە شەڕەنگێزەکان ئەو چارەسەرەیان لایە، هەرچەندە باوەڕداران فاکتەری نەخۆشیو کاریگەرییەکەی لایان ڕوونو ئاشکرایە، بەڵام کاریگەریی بنەڕەتی لە ڕێگەی ئەو کەلتوورەوە سەریهەڵداوە کە هیچ ئەندامێکی ئەو کەلتوورە ناتوانێ بە ئاسانی چاوی لێبپۆشێو چەمۆڵەی ئەو دێوەزمەیە لەسەر خۆی لابات.

ئەم جیاکارییە لە چارەسەریو خۆپارێزی کارە نوشدارییەکاندا هەڵقوڵاوی ناخی ئیکۆلۆجی، کەلتووری، کۆمەڵایەتییە کە (ئەکیرکخت) بەم جۆرە ڕوونی کردۆتەوە[٧٨].

١-نوژداری تەقلیدی یەك جۆر نییە، بەڵكو چەند جۆرێكە لە كاری پزیشكی تەقلیدی بە شێوەی جیاواز.

٢-ئەم جیاوازییانە زۆرجار لە ئاستی شێوەدا دەبن، بەڵام لەسەر ئاستی توخمو پێكهاتەكان زیاتر لێكدەچنو یەكانگیرن –چونكە شێوە پزیشكییەكان بە ژمارەیەك لە توخمی هاوبەش لەنێو خۆیاندا بەستراون، لە ڕووی چارەسەركردنو نەخۆشییەكان یان هەندێ توخمی كەلتووری لای ژینگە سرووشتییەكان، هاوشێوەن، هەرچەندە كۆمەڵگەكان جۆربەجۆر بن، جیاوازی لەسەر ئاستی جۆری پزیشكیی كە لە سەری دروستبووەو پشت بە سیاقە كەلتوورییەكەی دەبەستێ، نییە.

٣-سەرجەمگیریو پابەندبوونی توخمە پزیشكییە جیاوازەكانو بەستنەوەیان بە پێكهاتە كەلتوورییە گشتیەكە، بۆ كۆمەڵگە جیاوازە، بە جیاوازیی پێكهاتەی كەلتووریی كۆمەڵگەیەك بۆ ئەویدی بە پێی ئەو سنووربەندییانەی كە جۆری كەلتوورە باوەكە پێكدێنێ.

نوژداری میللی یان تەقلیدیو شوێنو ئەو بابەتانەی تر كە ئەچێتە خانەی باوەڕە

میللییەکانەوە، چەند وەزعێکی جیاواز وەردەگرێ لە لایەن بڵاوبوونەوەو مومارەسەوە. ئەم جیاوازییەش بە چەند فاکتەرێکی دەروونیو کۆمەڵایەتی، کەلتوریو ئیکۆلۆجییەوە پابەندە. نوژداری لە ژینگە دابڕاوەکاندا بە هۆی لاوازی لە پەیوەندیکردن بە دونیای دەرەوە، زاڵ دەبێ، هەرچەندە پەسەندکراو بێتو لە هەندێ شوێنی مەدەنیدا مومارەسە بکرێو هاوشان لەگەڵ پزیشکی نوێدا پێڕەو بکرێ سەرەڕای ئەوەش نوژداری کەمتر لە کۆمەڵگە شارنشینەکاندا کاری پێدەکرێ[٧٩] .

## سنووربەندییە کاریگەرەکان لە شێوازی نوژداریو پرۆسەکردنیدا

نوژداری بە توخمو پێکهاتەو شێوازەکانییەوە، چەند سەدەیەکی لە تێڕامانی کارا، تیۆری زەینیی نەترسانە بەسەربردووە، بەوەی ئەزموونەکانی چەندەها بار جەختی لەسەر کراوەتەوەو تاوتوێ کراوە، جگە لە ڕاستگۆیی ئەم باوەڕو تیۆرانە، ڕێکەوت هەندێ جار ڕۆڵێکی گرنگی لە دۆزینەوەی تایبەتمەندی ئەو توخمو مادانە بینیوە دواتر وەکو مادەیەکی پزیشکی دەوستاو دەست دەکاتو وەکو

شێوازێکی چارەسەری یان خۆپارێزیی باو پشتی پێدەبەسترێ.

نموونەی ئەوەش ئەوەیە کە نوژداری عەرەبی (اسحق بن حنین) باسی لێوە دەکات، دەڵێ ژنێك تووشی نەخۆشییەك بوو، پزیشکەکانی هاودەمی خۆی نائومێد بوون لە چارەسەرکردنی، هەروەها ئەڵێ بە رێکەوت چنگی لە رووەکی (راسن)[٨٠] گیربوو، لێی خواردو چاکبووەوە، ئەنجا لەسەر خەڵکی تر تاقیکردەوە هەمان ئەنجامی دەستکەوت. بەم جۆرە خەڵك ئەم دەرمانەیان ناسی کە چاکەو بەکاریان هێنا.. هەر بەو جۆرە مرۆڤی سەرەتاییش. ناوی ئەو دەرمانەی ئەزبەردەکرد کە لێی سوودمەند دەبوو یان خەڵکی تر سوودی لێدەبینی لەو نەخۆشییانەی کە تووشیان دەبوو. هەروەها ئەو دەرمانانەش کە چالاك نەبوایەو زیانبەخش بووایە رەفزی دەکردەوە، نوژداریو دەرمانسازی هونەری چارەسەرکردن هاتە کایەوە[٨١].

لیڤی شتراوس رۆڵی ئەزموونگەریو گەرانە خۆویستەکانی بە دوای کەرەستەو مادەکان بۆ مەبەستی پزیشکی، پشتراست کردەوە، لە هەندێ لە وتارەکانیدا[٨٢] ئاماژە بەوە دەکات چەند بە خێرایی

بەکارهێنانــــە پزیشــــکییەکەی ئــــەو نەمامــــەیان دۆزییــــەوە، کــە لــە دونیــای نوێــوە بــۆ فلیــپین گواستیانەوەو پەروەردەیان کرد، بە هەمان شێوە کە لە دابونـەریتی مەکسیکدا پێڕەو کراوەو بۆ هەمان مەبەست بە کاریان هێناوە.

هـەروەها شـتراوس شایاتحاڵی یـەکێ لـە زاناکـانی زیندەوەرزانییــە لــە لێکدانــەوەی ئــەم دیاردەیــەدا ئەنووسێ، ئەو ڕووەکانەی کە قەدو گەڵاکەیان تاڵە لە فلیـپین بـۆ چارەسـەری ئـازاری گـەدە بـەکاری دێـنن. هــەر کــاتێ ڕووەکێــك بدۆزنــەوە هــەمان ئــەو تایبەتمەندییــەی هــەبێ، یەکســەر دەیخەنــە ســەر تاقیکردنەوەکـەی خۆیـان. چـونکە زۆربـەی خـەڵکی فلیـپین خـەریکی تاقیکردنـەوەی ڕووەکـەکانن‌و هـەر خۆیــان زوو درك بــە ڕێگــەی بــەکارهێنانی ئــەو ڕووەکانە دەکەن کە لە دەرەوە پێیان دەگات، ئـەوەش پێوەرێکــە بــۆ ئــەو جــۆرە ڕووەکانــەی کــە لــە کەلتوورەکەیاندا ئەیناسن.

تۆژەرەوەکان ئەو ڕۆڵەی کە پرۆسەی پێگەیانـدنی کـەلتوورو بـە کۆمەڵایـەتیبوون، ئـەیگێڕێ بـە هـەدەر نــادەن، لــە پاراســتنی ئــەو شــتەی پەیوەنــدی بــە نوژدارییــەوە هەیــە، لــە شــێوازو نــاخ‌و چــەمکەکان

ئەوەی کە لە کۆمەڵگە لە میانەی زنجیرە کەڵەکەبووە درێژخایەنەکانـدا بـۆ فاکتـەرەکانی پێشـوو، گرنگیـی خۆی هەبووە.

## کاریگەریی کارلێکی مرۆیی-ئیکۆلۆجی سەبارەت بە نۆژداری وەکو فاکتەرێکی سنوردار

لە گرنگترین سنووربەندە کاریگەرەکانی نۆژداری، کارلێکی نێوان مرۆڤ و ڕیتمی ئیکۆلۆجییە. سەرچاوە ژینگەییەکان لە گژوگیای پزیشکیو بەردی پیرۆز، لم پێکـدێت، ئەمانــە نــاتوانن بــە تــەنها نەخۆشــەکان چاکبکەنەوە، ئەگەر کارامەیی مرۆڤی لەگەڵدا نـەبێو مامەڵـەی لەگـەڵ نـەکات. کارامـەییش بـەبێ بـوونی سەرچاوە سرووشتییەکان کە مامەڵەی لەگەڵ ئـەکاو ملکەچی دەکات بۆ بەکارهێنان، هیچ بەهایـەکی نییـە بــە چاوپۆشــین لــە مــەودای ڕاســتو دروســتی ئــەم بەکارهێنانـــە یـــان بـــەکارهێنانی هەڵـــەی ئـــەم سەرچـاوانە. کـارلێکی نێـوان شـارەزایی مـرۆڤ و سەرچـاوە ژینگەییـەکان لــە جــۆرو کەرەســتەی بــەکارهێنان، لــە پیــادەکردنی کــاری نۆژداریــدا

مومکینه. شارەزایی کەلتوور بەهێز دەکات، کەلتوور خۆشی شارەزایی دەدات. بۆ نموونە ئەگەر ڕووەك یان چەند سەرچاوەیەکی گیانەوەری تێکەڵ بکرێو چەند مادەیەکی تری وەکو ماستو هەنگیوینی تێبکرێو دوای کوڵان بدرێتە نەخۆش، ئەوا شێوازی چارەسەرکردن، کاراترو کاریگەرتر دەبێت[٨٣].

مرۆڤ لە نێوان کارامەبوونو ژینگەدا لە سنووری خۆی ناوەستێ، بەڵکو ئەکشێ تاکو لە هەموو توانا ژینگەییو مرۆڤییەکانی تر سوودمەند دەبێ. هەندێ جار لێی گەرم لە چارەسەری هەندێ نەخۆشیدا بەکاردەبرێ، هەندێ جاریش بەرد لە چاکبوونەوەی هەندێ نەخۆشیدا بەکاردەبەن وەکو ڕەژووی بەردینو شیری ئەو گیانەوەرانەی کە ناخورێن وەکو شیری کەر لە چاکبوونەوەی هەندێ نەخۆشی وەکو هەوکردنی زمان بەکاردێت.

کەواتە خەڵك هەموو ئەو شتانە تاقی دەکەنەوە کە لەگەڵ یاساو ڕێساو نەرتیە باوەکان یەکانگیر دەبێتەوە، لەگەڵ پێودانگە کەلتوورییەکان، دەگونجێ پێش ئەوەی پەنابەرن بۆ کاری پزیشکی نوێ[٨٤].

گەلانی سیبەریا بەرهەمە سرووشتییەکان بۆ مەبەستی پزیشکی لە میانەی پێناسەی وردەوە، لە

میانـــەی بـــەهای تایبەتمەنـــدەوە، لەســـەر چـــاودێری تایبـــەت، بلیمـــەتی، تێبـــینی وردی وردەکارییـــەکان، ئیشـــکردن لەســـەر جیـــاوازیو بەراوردکارییـــەکان، هەموو ئـەم خەسـڵەتانە لەسـەر نـەخۆشو پیشـەوەر یان نووژدارو بەهرەمەند یان لـە ڕێگـەی ڕێکەوتـەوە، پـراکتیزە دەبێ.

هەندێ کۆمەڵگە پێیان وایە خـواردنی جاڵجاڵۆکـە و کرمـی سـپی بـۆ چارەسـەری نـەزۆکی باشـە، لای (یاقوتو ئەتلیمان) بەزی گوێرەکەی ڕەش بـۆ هـاریی سەگ (داء الکلب) بـەکاردێت، لای (ئۆسـیت) ڕووەکـی (وردان) ئەگەر ورد بکرێت یان زراوی مریشك ئەگـەر بخـورێ بـۆ دومـەڵو فتـق بـەکاردێت، لای ڕوس لـە سۆترکت کرمی سووری فلیقاوە، بۆ نەخۆشی جومگـە بەکاردێ. لای یاقوت زراوی ماسی جـوری (زنجـور)[٨٥] بـۆ نەخۆشـییەکانی چـاو بـەکاردێت، (لای بۆریـات) ماسی سپیلکە[٨٦]، قرژاڵ ئەگەر بە ساغی بخورێـت لـە پەرکەمو هەموو نەخۆشییەك چاکمان دەکاتەوە (لای خەڵکی سیبەریا)، مەرگەی کۆتر بۆ چارەسەری کۆکە (لای بۆریات)، ئەگەر هەردوو قاچی باڵندەی تیلفۆس ورد بکەیت بۆ چارەسەری گازی سـەگ بـەکاردێ (لای قەوزاقەکان). ئەگەر شەمشەمەکوێرە وشك بکرێتەوە

بۆ تا بەکاردێت (لای ڕووسەکان لە ئەلطای)، گەلی بۆریات پێی وایە گۆشتی ورچ ٧ جۆر نەخۆشی چارەسەر دەکات، خوێنەکەی ٥ جۆر نەخۆشی، بەزەکەی ٩ نەخۆشی، مێشکی ١٢ نەخۆشی زراوی ١٧ نەخۆشی، مووەکەی ٢ نەخۆشی چاکدەکاتەوە.

هەروەها لیڤی شتراوس ئاماژە بەوە دەکات کە ڕەگەزە گیانەوەریو ڕووەکییەکان نەناسراون بەوەی سودبەخشن بەڵکو وا وەسف کراون یان کراون بە بابەتێکی گرنگ چونکە لە سەرەتادا بابەتێکی مەعریفی بوون.. لەبەر ڕووناکی ئەوەی کە ڕابورد، ئەو فاکتەرو سنووربەندییانەی کە کاریگەریی لەسەر مومارەسەو ئەو شێوازانە هەیە کە نوژداری پشتی پێدەبەستێ، بەم جۆرە کورت دەکەینەوە:

١-فاکتەری ژینگەیی: بە بوونی سەرچاوە سرووشتی، کانزایی، ڕووەکیو گیانەوەرییەکانەوە، سەرچاوە دەگرێ.

٢-خۆشویستنی پیشەکە یان ئارەزووی فێربوونو خۆهەڵقورتاندن.

٣-ئەزموونو شارەزایی پێشوو و زانیارییە کەڵەکەبووەکانو ئاسۆی زەین فرەوانی.

٤-فاکتەری ڕێکەوتو خواستنو دۆزینەوە.

٥-چەمك و باوەڕو ئەو دیدانەی کە کۆمەڵ سەبارەت بە نەخۆشیو تەندروستی باوەڕی پێیەتی.
٦-ڕیتمی پزیشکی کە لە هەناوی کەلتووردایە، بەشێکە لێیو بە توخمەکانی کاریگەرەو ئەرکی بونیادنان لە ئەستۆ ئەگرێ.
٧-نەریتەکانی خواردنو شێوازی خۆراك.

## نوژداری لە نێوان زانستو نووشتەگەریدا

ئەکیرکخت ئەڵێ: (بۆ تێگەیشتن لە نوژداری سەرەتایی، پێویستە دوورتر لە پێودانگو تێگەیشتنی خۆمان هەنگاو هەڵێنین)، ئەم دەستپێکە ڕێسایەکی میتۆدی دەگرێتەخۆ، داوا لە توژەرەوەکان دەکا بۆ دامالینی بەهاو دیاردەو هەلوێستە کەلتووریو کۆمەڵایەتییەکان، لەبەر ڕۆشنایی واقعو کاری نوژداری، ئەگینا ئەو برگانەی لە بەهاو پێودانگو تێگەیشتنی کۆمەڵگەکانیانەوە دەرئەچێ، بە پێچەوانەی واقعو دیاردە لێکۆڵراوەکان بریاری لێئەدرێ.

ئەگەر لەم سەرەتاگەیەوە دەستپێبکەین، ئەوا ئامانجمان لە نوژداری دەبێتە شێوەیەك لە نوشتەگەری یان نموونەیەك لە زانست، یان لە نێوانی هەردووکیاندا؟ نوژداری بەوە دەناسرێ، هەلگری هەموو ئەو فیکرو بیروبۆچوونە تەقلیدیو باوەڕانەیە سەبارەت بە نەخۆشیو چارەسەرکردن، لەگەلْ هەموو ئەو شتانەی پەیوەندی بەوانەوە هەیە لە ڕەوشتو شێوازو ئەو مومارەسانەی پەیوەندی بە خۆپاراستن لە نەخۆشیو چارەسەرکردنی هەیە.

بە چاوپۆشین لە ڕیتمی ڕەسمی بۆ پزیشکی زانستی[٨٨]. زانا (یۆدر) ئاماژە بە دوو لقی بنەڕەتی لە نوژداری دەکا[٨٩] ئەوانیش:

١-نوژداری ڕوحی: بە (نوژداریی تەمومژاوی) یان (نوژداری ئایینی- سیحری) دەناسرێ، نووشتە (الرقی) جادوو (التعاویذ)، ورتە ورتو وشە پیرۆزەکان وەکو چارەسەری نەخۆشییەکان، بەکاردەهێنێ. ئەم جۆرە نەریتە دیدێکی ئالۆزی بۆ جیهان هەیە و لۆجیکی نییە (پێش بە زانستی بوونی).

٢-نوژداریی میللی سرووشتی: ناوی تر لە خۆی دەنێ وەکو نوژداریی ڕووەکی، نووژداری گژوگیا یان

نــوژداری زەیــنی. وەکــو کاردانەوەیــەکی خێــرا بــۆ وەڵامدانــەوەی مــرۆڤ بــۆ ژینگــە سروشــتییەکە کــە هەستکردنی مرۆڤ لـە چارەسـەری نەخۆشـیەکاندا لـە ڕێگـەی گـژوگیاو ڕووە کانزاکانــەوە مسـۆگەر دەکـات، هەرچـۆن ئەنـدامانی لەشـی گیانــەوەریش ئەخرێتــە کایەکەوە.

لـەم دەروازەیــەوە ئــەتوانین بڵــێین کـە نــاتوانین بڕیـار لەسـەر بـوونی دوو لایەنـەی کـاری پزیشـکیو چارەسەری میللی بدەین بەڵکو تێکـەڵبوون لـە نێـوان هــەردوو لایەنەکــە هەیــەو مومارەســە ئــایینیو ســیحرییەکان هاوکـات لەگـەڵ مومارەسـەو شـێوازە سرووشتیو زەینییەکاندا تێکهەڵکێش کراون.

هەنــدێ جــار بەســەر کۆمەڵگــە میللییەکانــدا زاڵدەبێ هەندێ تۆژینەوە(٩٠) ئاماژە بـە بـوونی ئـەم پەیوەندییە دەکەن، لێرەدا هەندێ مادەی چارەسـەری میللـی هــەن کــە سرووشــتێکی کــانزایی، گیانــداری، ڕووەکییان هەیە وەکو قوڕو قووڕی وشك (الصلصال) و ئەنـدامی گیانـەوەر، میـزی مـرۆڤ، پیسـیی مـرۆڤو گیانەوەر.

زۆر شــتی تــری لــەو بابەتــە لەســەر ئاســتێکی بەرفرەوان بۆ مەبەستی چارەسەرکردن بەکارهێنراوە

لەگــەڵ بــوونی شــێوازی تــر وەکــو خوێنبــەردان Scarification، گـــەرماوی تەندروســـتی Hotbaths و مەلـەکردن لـە ئـاوی کـانزاییو ئـاوی کانییـە پـیرۆزو بیرەکـان، بـەڵام ئـەم کەرەسـتەو شـێوازانە بـە شـێوەی سـرووتو ڕێـوڕەسمی ئـاینی بـەکارهاتووەو توخمـە سیحریو ئاینییـەکانی تـریش بەشـداری تیـا کـردووە وەکو نوشتەو جادوو و دووعـاو سـرووتە ئاوازییـەکان (تراتیل).

ئـــەم بارودۆخـــە پســـپۆڕەکانی هەژانـــدووەو پرســـیویانە، ئـــەو چـارەکردنەی لـە ڕێگــەی ئــەم مومارەســـەو شـــێوازو ڕەفتارانـــەوە بـــەدی دێـــت، ئەگەڕێتــەوە بــۆ کارتێکردنــە مادییەکــە یــان بــۆ کاریگەرییە ڕۆحیو دەروونییەکان؟

## نوژداریی میللی ڕۆحی:

جادووگەری لـە ڕووی تیـۆریو پراکتیکـەوە پشـت بــە چــەند ســرووتو فۆرمیۆلایــەك کــە کاریگــەری لەسـەر هێزەکـانی ئـەودیوی سرووشـت هەیـە، وەکـو پاسـاوێك بـۆ ڕووداوێـك کـە بتـەوێ ڕووبـدات یـان نەهێڵێ ڕووبدات. ئەمەش لە دیدی پیرەوکەرانییـەوە

کارێکی لۆجیکییە، نموونەی یەکەم چەمکی دەردو ئەنجامەکانییەتی کە مرۆڤ لە ژیانیدا پێڕەوی کردووە[٩١]، جادووگەری ڕۆڵێکی دیاری لە بواری پزیشکی میللی، لە کۆمەڵگە تەقلیدییەکان هەیەو چارەسەری سحیری بەشێکی زیندووە لە مومارەسە میللییەکانی نوژداری، بۆ ئەم مەبەستە بە نووشتە، جادوو، سرووتە ئاوازییەکان (تراتیل)، ئەستێرەناسی، فێشاتو مانا بەست کە ڕەنگدانەوەی کارلێك پابەست بوونە لە نێوان توخمە جیاوازەکانی کەلتووری میللی.

لە کاتێکدا زۆرجار ناتوانین نوژداری یان پزیشکی میللی لە توخمە تیۆرییەکانو بیروباوەڕەکان وەکو سیحرو هێزی غەیبی لێك جیابکەینەوە. خەڵك پێی باشە هۆی نەخۆشی بگێڕێتەوە بۆ هۆکارە سیحرییەکان، جادووگەرەکانیش بە شێوازی خۆیان چارەسەری ئەو نەخۆشیانە دەکەن وەکو نەخۆشییە دەروونیو زەینییەکان، نەزۆکی، زاوانەبوون هۆکاری ئەم نەخۆشییانە بە هۆی کردەوە جادوویىو هێزە شەڕەنگێزەکانەوە ڕوودەدات، بۆیە چاکبوونەوەش بە ڕێوڕەسمی نووشتەگەرییەوە بەدی دێ، بە پێی

پەیوەندی نێوان چەمکی تەندروستیو نەخۆشی کە لەگەڵ شێوازو چارەسەرکردندا بگونجێ.

دەستنیشان کردنی نەخۆشیو ناسینەوەی فاکتەرەکان یارمەتی شێخو نووشتەگەرانو جادووبازەکان ئەدا کە هەڵسن بە پێوانی حاڵەتی نەخۆشەکە بۆ زانینی هۆکاری نەخۆشییەکە (بەم پرۆسەیەش دەڵێن پێوەری شوێنەوار).

ئیتر هۆی نەخۆشییەکە هەرچییەك بێت وەکو ئیرەییو حەسوودی پێبردن، بە هۆی هێزی سەرووی سرووشتەوە، یان نەخۆشەکە لە لایەن جنۆکەوە دەستی لێوەشێنراوە، یان دێوەزمەی شاخدار کە رووحەکان خۆیانی تێدا ئەشارنەوە[٩٢]. رەنگە نەخۆشەکە چاکبێتەوە ئەگەر هۆیەکەی سیحر بێت یان جنۆکە دەستی لێوە شاندبێ یان حەسوودی پێبرابێ ئەویش لە میانەی رێورەسمی پزیشکی سیحرئامێزەوە، لە رێگەی رووحو هێزەکانی سەرووی سرووشتەوە، لە رێگەی خواردنی دەرمانو دەرمانە رووەکییەکان، دەرمانە گیانەوەرییەکان، دەرمانە کانزاییەکان، لە گەڵیشیا سرووتە نووشتەگەرییەکان، جادووگەری بۆ دەرپەڕاندنی رووحەکانو بە بەکارهێنانی سرووتی گۆرانیو سەمای سیحری —

وەکــو زار بــۆ نموونــە[٩٣]، تەبــەڕوك لــە لایــەن سـەیدەکانەوە، هـەروەها چـاککردنەوەی نـەخۆش بـە دەستی پیاوچاك‌و ئەولیاکان بـەڵکو تەنانـەت هەنـدێ گێل‌و گەمژەش ئـەو کـارە دەکـات، سـەردانی نـەخۆش بۆ سەر مەزاری پیاوچاك‌و ئەسحابەکان، هەروەها بـە فالگرتنــەوەو بەختگرتنــەوەو دوعــای دەمبەســت (حجب وتعـازیم)[٩٤] ئەگـەر پرسـیارەکەی پێشـوومان ئەوە بـێ، ئایـا ئـەو چـاکبوونەوەیەی لـەم ڕێگایانـەوە بەدەست بێـت بـۆ کاریگـەرە مادییـەکان یـان ڕوحییـە توندوتیژەکان دەگەڕێتەوە، ئێمەش دەڵێین فاکتـەری ئــــەو نەخۆشــــیانە کەڵەکــــەبوونی نەخۆشــــییە دەروونییەکانە، دەوروبـەری نەخۆشـەکەو هەلومـەرج بۆ ئەو نەخۆشییانە ڕەخساوە تاکو کاریگـەری لەسـەر ژیــانی نــەخۆش دانــاوە، زۆرجــار بەرژەوەنــدی هەڵچـوونە دەروونییـەکان‌و سـەرکەوتنی چارەسـەرە ڕووحییـەکان وای خواسـتووە، لای نـەخۆش وا پیشـان بـدرێ توانـای سـەرکەوتنی نـووژدار یـان نووشـتەگەر زۆر بەرفرەوانە تاکو نەخۆشـەکە لـە نەخۆشـییەکەی دامـاڵرێ‌و چـاکبێتەوە، لێـرەوە کاریگـەریی فاکتـەرە دەروونی‌و بیروباوەڕە ئایینیەکان لـە چارەسـەری ئـەم حاڵەتانەدا ڕوون دەبێتەوە.

هەنـدێ کەرەسـتەی نـوژداریی میللـی ڕۆحـیو شـێوازەکانی ئـەو شـێوازو کەرەسـتانەی لـە کـاری پزیشـکیو چارەسـەری ڕووحـی لـە مومارەسـەو پێڕەوەکانیدا پشتی پێدەبەسترێ ئەمانەن:

١-مانا: هێزێکی نادیاری بەدەر لە سرووشتە، بە تـەواوی لـە هێـزە مادییـەکان دابـڕاوەو بـە شـێوەی جۆراوجۆر کاریگەری هەیە ئیتر یان خێری پێیە، یان شەڕ. بە گوێرەی هەندێ بیروباوەڕ ئەم هێزە توانایـەکی لـە ڕادەبـەدەر ئـەخوڵقێنێ، گـوڕێکی سیحرئامێزی دەداتێ، بۆیە کێ بیەوێ باری خۆی بخاتە ژێر ڕکێفییەوە، ئەوا هێزو شکۆمەندی ئەبەخشێتە ئەوانەی گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی بوونە[٩٥].

خاوەن ماناکان هەندێ کەسانی ئایینی سەر بە ئەسحابەو سەروەرانو یارانی خودان، لە عێراق خاوەن نیشانەی پیاوچاکیو شکۆمەندو باوەڕداران بە مانا لە نێوان پۆلیتیزییەکاندا بڵاوە، ئەوان سەرچاوەی ئەم چەمکەن، هەروەها شامانیەکانیش باوەڕیان بەم چەمکە هەیە کە لە ئەسکیمۆو ئەمەریکای باکور ئەژین.

لــە کاتێکــدا شــامانەکان لــە پێشکەشــکردنی خزمەتگوزاری بۆ کۆمەڵگاکەیان لەسەر ئـەو بنەمایـە کاردەکــەن کــە نەخۆشــی لــە ئــەنجامی بزربــوونی رووحەوە پەیدائـەبێ، شـامانەکان بـە رێگای تایبـەتی خۆیــان رووح ئەگێڕنــەوە بــۆ جەســتە، ئەگــەر نەگەڕایەوە، ئـەوا نەخۆشـەکە بـەرەو مـەرگ دەڕوات، شــامان هەیبــەتو توانــای لەدەســت ئــەدات[٩٧] گەڕاندنەوەی ڕوح لە میانەی چەند ڕێو ڕەسمێکەوە دەکرێ تـاکو تەندروسـتی بـۆ نەخۆشـەکە بگێڕێتـەوە ئەویش لە میانەی تف ڕۆکردنە دەمی نەخۆشەوە لـە لایەن شێخو سەیدەوە، یان دەسـتهێنان بەسـەرداو بـە بەرەکـەتی پیاوچـاك یـان لـە لایـەن جادووگەرانـەوە نــەخۆش چــاك دەبێتــەوە، زۆر مــەزار لــە عێــراقو نیشـتمانی عــەرەبو دونیـای ئیسـلامیدا هـەن ئـەم بیروبـاوەڕە میللییانــە لــەخۆ دەگــرێ، هەنــدێ لــەو مەزارانە چارەسەری هەندێ نەخۆشی دەکـەن لەوانـە هەردوو گومبەزی سـەیدەکانی عـەلی غـەربیو عـەلی شەرقی، تا ئێستاش باوەڕ بە تواناکانیان دەکرێ.

٢-نووشتە (التمائم): Fetish: تـەنێکی سرووشـتیە یان دەستکردە، زیندووە، یان تـەنی ڕەقـە بـاوەڕ وایـە ئەم تەنە ئەتوانێ هێزێکی ناسرووشـتی بەدەسـتبێنێ،

ئەگــەر ڕووح کاریگــەری بەســەریەوە هــەبێ، دواتــر پێویســتە ڕازی بکــرێو بــۆ مەبەســتی جادووگــەری بــەکار دەبــرێ، دوای ئــەوەی پــڕ لــە ڕووح کــراوە[٩٨].

چــاوەزار (تمیمــة) دەکرێتــە قــەد نەخۆشــدا، تــاکو نەخۆشیو شەڕ دەرپەڕێنێ، باوەڕکردن بەم ئامرازانە لــە کــەلتوورو کۆمەڵگــە جۆربەجۆرەکانــدا بــڵاوە. میســــرییە کۆنــــەکان نووشــــتەی فرەشــــێوەیان بــەکارهێناوە، عبرییــەکان بۆکسێکی بچووکی شێوەی قــاپ قورئــان (احجیــە)یــان هــەڵگرتووەو دەقــەکانی تەوراتیان تیا نووسیوەتەوە، خاچپەرستەکان خاچیان بــەکارهێناوە، موســڵمانەکان میــدالیای شــێوە قورئــان یــان قــاپ قورئانیــان، بــەکارهێناوە، نوشــتەو چــاوەزار شتی پیرۆزو دەقە ئایینیەکانی لەخۆگرتووە. چــاوەزار مادەکــەی جیــاوازە، هنــدێکیان لــە دانو ئێســكو پروسکی گیانەور دروستکراوە جۆری هەیە لە شێوەی پەیکەری بچووکدایە، هــەروەها کوژەکــە، قوماشــی لــە بنێشت گیراو، بەردی پیرۆز نەقیمی ســەر ئەنگوســیلە کە باوەڕ وایە ژارو نەخۆشی دەمژێ.

خەڵکی بەغدا ئەم ئامرازانە بۆ هەندێ نەخۆشــی وەکــو کۆکــە ڕەشــە کــە لــە دەنگــی چــەرخەی ئــاو (خنزیرە) دەچێت (بە جۆرێك دەنگی کۆکەکە ڕەقو

ناخۆشە) بەکاردەهێنن. ئەگەر منالەکە تووشی ئەم نەخۆشییە بێت ئەوا دایکی منالەکە لای پێلاو درووییەك پارچەیەك پێست لە شێوەی ئاسك دەبڕێ، لە ملی منالەکەی دەکاتو هەموو رۆژێکیش بۆ ماوەی حەوت رۆژ لە کاتی زەردەی خۆراوادا دەیباتە لای قەسابێك کە پیشەکەی بە میراتی بۆ مابێتەوە تاکو شێوە ئاسکەکە بە چەقۆکەی دەستی بریندار بکات دوای تەواوبوونی حەوت رۆژەکە کۆکەکە نامێنێ وێنەی ئاسکەکەش لە سەرە ڕێگە فڕێ ئەدرێ[99].

٣-دێوبەند (التعاویذ): تالیسم (الطلسم) بریتییە لە تەنێکی بچووك، نەخۆش ئەتوانێ بە ئاسانی هەڵیگرێ وەکو کوژەکەی شین، باوەڕ وایە دێوبەند کاریگەریەکی جادوویی هەیە، ڕەنگە سوودی هەبێ یان ئازار بەخش، ئەم تەلیسمە هێزو بەختێك لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ پێی دەڵێن چاوەزار (تمیمە) ئەویش بەوەی کە تاك ئەپارێزێو پێی دەڵێن دێوبەند (حجاب) کە لە تەنگژەو مەترسییەکان دەیپارێزێ[١٠٠] لەم پێناسەیەوە ئەتوانین بلێین لەگەڵ نووشتەدا نزیکە.

(سلیم) پێی وایە ئەم دێوبەندە شێوازێکی قسەکردنی ئامادەکراوە، مەبەست لێی ئەو کردە جادووگەرییانەیە بە شێوەی وشە یان ڕستە یان گۆرانیو لۆرە کە جادووگەرەکە بۆ مەبەستی دەستەبەرکردنی کاریگەریی سیحرەکە ئەیڵێتەوە، دەستەواژەو گوزارشتی کۆن بە شێوەی چرپەو ورتە ورت کە ناڕوونەو هەندێکیان ڕستەی بێمانانو ئەینووسێتەوە تاکو ئەیخاتە نێو نووشتەیەکەوەو نەخۆشەکە بە شانی خۆیدا هەڵیدەواسێ[١٠١].

نووشتە بە پاڕانەوە لە خوداو ڕووحەکان دەستپێدەکاو بۆ دەفعی بەڵاو نەخۆشی بەکاردێو لە کۆمەڵگەی ئیسلامی خۆماندا پاڕانەوەکان بە ئایەتی قورئانی لە نووشتەکانی تر جیادەکرێنەوە. تا ئێستاش نووشتەکردن لە کەلەپووری میللی خۆماندا دەستێکی باڵاو کاریگەری لای هەندێ کەسدا هەیە بە تایبەتی لای لادێ نیشنەکان. عەرەب نووشتەیان ناسیوەو لە سەرو پرچیان هەڵواسیوە لە کاری نوژداریدا، لە نائومێدی ئاکامی خۆشەویستیدا، بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی بەکاریان هێناوە[١٠٢] عێراقییە کۆنەکان لە کۆنترین کەرەستەکانی چارەسەرکردنی دائەنێنو پێیان وایە نووژداری

پەیوەنــدی بــە کــاری جادووگەرییــەوە هەیــە. لــە کەلەپووری میللیمانـدا زۆر جـار جادووگـەرو سـەیدو مەلا لە ڕێگەی نووشتەو هەنـدێ جار نـزای تایبـەتی تێدا دەنووسرێ نموونەی ئەوەش بەم جۆرەیە[١٠٣]:

أ-نـزای تایبـەت بـە سەرئێشـە (بسـم الله الـرحمن الـرحیم الحمـدلله رب العـالمین، والصـلاة والسـلام علـی سیدنا محمد خاتم النبیین، و علی الـه وصـحبه وسـلم اجمعـین، والحمـدالله رب العـالمین، ولـه مـایکن في اللیـل والنهار وهو سمیع العلیم. الم تـر ربك کیف مـد الظـل، ولو شاء لجعله ساکنا. بسم الله الـرحمن الـرحیم، ذلـك تخفیف من ربکم ورحمـة، بسـم الله الـرحمن الـرحیم، یرید الله ان یخفف عنکم وخلق الانسان ضعیفاً. بسـم الله الرحمن الرحیم، الآن خفف عنکم وعلـم ان فـیکم ضعفاً ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظیم).

ب-نوژداریی میللـی نـزای پێچـراوە بـەکاردێنێ بـۆ مەبەستی پزیشکیی گیانەوەریش.

د. محمد عبده محجوب ئەگێڕێتـەوە بـە ڕێکـەوت لە ماڵی یەکێ لـە نـووژدارە دەوارنشـنیەکان دەبـێ کـە (التجاز)ی پێـدەڵێن، پیاوێـك هـاتو گازنـدەی ئـەوەی کرد کە مـەڕو ماڵاتەکـەی یـەك لـە دوای یـەك مـردار دەبنەوە. توجازەکـە لێـی پرسـی ژمـارەی فـەوتاوەکان

چەندە، ئەو ماوەیەی نێوان مرداربوونەوەی سەرێکی مەڕ لەگەڵ ئەوی تردا چەندە، ئەنجا شریتێکی باریکی کاغەزی دەرهانیو لەسەر نووسی:

"بسم الله الرحمن الرحیم (فسبحان الله حین تمسون وحین تصبحون) سبحان الله (یخرج الحی من المیت ویخرج المیت من الحی، ذلکم الله فانی تؤفکون) اعوذ بالله من الوباء، والوخم والاوجاع ومن الابیض والاسود والاهود، والحسود، وجنودهم، اخرج ایها الوباء والوخم بقدرة من یحیی ویمیت" ئەنجا ئەم شێوەیەی خوارەوەی دروستکردو چەند پیتێکی لەناو دانا، هەندێ هێمای لە پاڵ پیتەکانەوە نووسی بەم جۆرە[١٠٤]: لەو پیتو هێمایانەی کە زۆرتر بۆ مەبەستی نووشتەکە نووسران: (محروح، طمح، ذوولهم، عسس، معصص حم عسق، جگە لەو ژمارەو شێوەو هێمایانەی تر، ناوە دیارەکانی خودای گەورەی نووسی.. هتد

| ب | ط | ر |
|---|---|---|
| ز | ه | ج |
| ر | أ | ح |

٤-شێوازی تر: نزاکردنو حاڵ لێهاتن Hymns لەو شێوازانەیە نووژداری میللیو تەقلیدی، لە میانەی خوێندنەوە ئاوازدارەکانەوە، کە پاڕانەوە لە خوا یان لە خواوەندەکان یان لە هێزەکانی سەرووی سرووشتن، پشتی پێدەبەستێ.

لای ئەو گەلانەی کە خوای تاکو تەنیا ناپەرستن، بە زیکرەوە نزای بەزەیی پیاهاتنەوە لە خواوەندەکانی خۆیان دەخوێننەوە، داوا دەکات لە خەم بیڕەخسێنێ، نەخۆشەکەی چاکبکاتەوە، ئارەزوویەکی بەدی بێنێ نزاو زیکرە ئایینیەکان، گرنگیەکی گەورەی لای گەلان هەیە، پیاوی ئایینی زیکر دەکات لە کۆمەڵگەکانی ئەسکیمۆو لایەنەکانی شامان یان قەشە لە بۆنە دیاریکراوەکاندا بەشداری تاکەکانی کۆمەڵ دەکا (وەکو کۆرس)، کۆرسەکە لە کەشو هەوای سەماو زیکردا Circumambulation بە دەفو تەپڵ لێدان دەچێتە ناو سرووتە ئاینییەکانەوە نموونەی ئەو سرووتانە زیکری دەروێشەکانە[١٠٥]. ئاهەنگەکانی (زار)یش لە هەندێ کۆمەڵگەدا تایبەتە بە ژنان، هەندێ جار شێوازی لێدانی لم بەکاردێ. لم لێدان، ئەوەیە نەخۆشەکە دەستی لەسەر لم دائەنێ، بەوەش شێوەی ناولەپی

لەسەر لەکە نەخش دەبێ، نوژدارەکە یان بەختگرەوەکە جۆری نەخۆشییەکە بزانێ ئەنجا حەوت موورو بە شێوەی بازنە دەکاتە دەستی، ئەنجا چاوی نەخۆشەکە دەنووقێنێ تاکو نهێنی نەخۆشییەکە بزانێ (کە زۆرجار ئیرەیی پێبردنە). ئەگەر دەرکەوت نەخۆشییەکە ئیرەیی پێبردنە ئەوا نوژدارەکە پارچەیەك گەڵا دێنێو لە شێوەی ژنێکدا دەیبڕێت ئەنجا گەڵاکە بە دڕك کون دەکا، لەگەڵ ناوهێنانی ئەو کەرەستانەی کە هۆی حەسوودی پێبردنەکەیە، دوای ئەوە گەڵاکە دەسووتێنێ بەوە بە باوەڕی خۆی نەخۆشەکە چاکدەبێتەوە(١٠٦).

ئەو نموونانەی لە بارەیانەوە دوا چەند شێوەیەکی نوژداری ڕۆحی ڕووندەکاتەوە کەنوژدارە میللیەکان لە پیاوانی ئایینی خاوەن توانا لە ڕادەبەدەرەکان، وەکو سەیدو پیاوچاکانو هەندێ جادووگەر هەڵئەسن، هەندێ جار ئەم نموونانە نزاکردنەکەیان هیچ هۆیەکی زەینی سرووشتی تیا بەدی ناکرێ. تۆژینەوە نوێیەکان ئاماژەیان بە کاریگەری فاکتەرە دەروونیەکان سەبارەت بە خولقاندنی ئامادەگییە وابەستەکان بە چاکبوونەوەی باری تەندروستیەوە بۆ هەندێ نەخۆشی بە تایبەتی

ئەوانـەی تووشـی نەخۆشـییە دەروونـیو دەروونـی-جەســـتەییەکان (Sychomatic) بوونـــە، بـــەڵام مومارەسـەکانی تـر مـۆرکی جادووگـەرییو فرتوفێـڵ تێیدا زاڵە، لە میانـەی گاڵتـەکردن بـە ئـەقڵو هۆشـی مرۆڤـە سـاکارەکان. لـە ڕاسـتیدا ئـەم مومارەسـانە هەنـدێ وەزیفـەی کۆمەڵایـەتیو تەندروسـتی لـە بەرژەوەنـــدی کۆمـــەڵ لـــە ڕووی خۆپاراســـتنو چارەســـەرکردنەوە جێبـــەجێ دەکـــات، بـــەڵام بـــۆ نەخۆشـــییە ئۆرگـــانیو فیزیکییـــە تەمومـــژەکان کاریگـــەریی لابـــەلای ترســـناكو زیانبەخشـــی لێدەکەوێتەوە. ئەو مومارەسە نوژدارییانەو هاریکاری ئەو مومارەسانەو ئاراستەکەری ئـەم مومارەسـانە کـە باوەڕی بە پێویستی کەلتووری کۆمەڵایەتی هـەبێ لـە میانـــەی ئـــەو مومارەســـەکردنەوە، ئـــەوا پێویســـتیە مرۆڤایەتییە بەرفراوانەکان بەدەستدێنێ. بـەڵام ئـەو مومارەسانەی کە بە جادووگەرییەوە پەیوەستن، ئەوا بەســـەر شـێوازو ڕەوشـــتی ئـــەو تاکـــە جادووبـــازەوە پـراکتیزە دەبێ کە لەو کۆمەڵانـەدا سـەریان هەڵداوە، کە کۆمەڵی سادەنو ساکارو ساویلکەن، وەکـو خـەڵکی لادێو گەڕەکـە میللیـەکان. ئـەو جادووبازانـە کتـوپڕ دێنەســـەر ســـینگی کۆمەڵگـــە، چـــونکە ســـیاقە

کەلتوورییـــــەکان زۆر ســـــیمای ئەقلانییـــــەتی لەخۆگرتووە، بەلام ئەوان بەدەر لەو سیاقەن‌و فیکرو بیرکردنـــــەوەیان لەگـــــەڵ ڕێـــــڕەوی پێکهاتـــــە کۆمەلایەتییـەکانی ئـەو کۆمەڵگایـەدا یەکناگرێتـەوە، بۆیە لە ڕاستگۆیی دایئەماڵێ، چونکە پێچەوانەی ئەو ئاکـارو ڕەوشـــتانە ڕەفتـــاری کـــردووە، کـــە ســـیاقە کەلتوورییەکان بڕیاریان لێداوە. ئـەو سـیاقانەش زۆر لە زانستەوە نزیکن، نـەك لـە کـاری جادووگەرییـەوە، بە تایبەتی ئەگەر زانیمان جادووگەری بە سیاقەکانی خـۆی نموونەیەکـە لەزانسـتو هۆشمەنـدی کـە بـە ئـەزموون‌و تاقیکردنـەوە بـەدی هـاتووە، ئەگەرچـی لایـەنی پـۆزەتیڤ بێـت، بـەلام ئـەوان ئـامرازی کـاراو چـالاکیان بـۆ گەیشـتن بـە مەبەسـت لـە دەسـتداوە، کەرەستەکانی بیروباوەڕیش پرۆگرامە نەك فرتوفێڵ.

## دەرمانە میللییەکانو بنەما کەلتووریەکانی

هەموو کۆمەڵگەیەکی کۆن، ئـەزموونو کارامـەیی خـۆی لـە باوباپیرانـەوە بـۆ بـەجێماوە، لـە میانـەی ڕاهێنـانی کەلتوورییـەوە. لـەو شـێوازە میراتگرییانـە، شێوازی چارەسەرکردنی میللی بۆ ئەو نەخۆشییانەی کـە بـەرەنگاری مـرۆڤ دەبنـەوە، چـونکە ژینگـە نـزیکترین سەرچـاوەی داهـاتی سرووشـتی مرۆڤـە، ئەگەر چارەسەرییە ڕووحییـەکانی لێدەرکـەین. ئـەوا ژینگـە سەرچـاوەی چارەسـەرکردنە سـەرەتاییەکان بـووە. ژینگـەو دەوروبـەر یەکـەم بەرهەڵسـتیکەری مـرۆڤ بـووە، وەڵامدانـەوەی مـرۆڤ بـۆ ئـەم ژینگەیـە لەسەر شێوەی تێگەشتنو شـێوازێك بـووە کـە بتـوانێ کۆنترۆڵی بکات. لەبەرئـەوە هەرچـی توانـای زەیـنیو جەسـتەیی هـەبوو لـە پێکهاتـەی کـەلتوورێکی سنوورداردا خەرجی کردووە. مـرۆڤ بـە ڕادەی سادەیی کەلتوورەکەیو ئامرازەکەی وابەستە بووە بـە ژینگـە، ئەنجا مەبەستو ئامانجـەکانی خـۆی هێـواش هێـواش بەسـەریدا سـەپاند ئـەویش لـە سـاتەوەختو هەلومەرجێکی دیاریکراودا.

مرۆڤ هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە ئارەزووی زانینی هۆیە نادیارەکانی کردووە، دیاردەی نەخۆشی چیەچیی مرۆڤایەتی بووە، لە میانەی هەوڵدانی بۆ فێربوون بە ڕاستی، بە هەڵەکردن، بە پەسەندکردنی زیانەکان تاکو توانی چەند چارەسەرێك بۆ نەخۆشییەکان بدۆزێتەوە لە ڕێگەی ئامانج یان ڕێکەوتەوە. چونکە لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا کارلێك دەکات، لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی ئەزموونو تێگەیشتنی خۆی بە تێپەڕبوونی سەدەکان چارەسەری یەکەمی دۆزییەوە. بەم جۆرە دەوروبەرو مرۆڤ یان مرۆڤو دەوروبەر کەوتنە بەربەرەکانێی یەکتر، مرۆڤ لە پێناو مانەوەی خۆیدا توانی وەڵامی گونجاوی دەوروبەر بداتەوە، بۆیە کەلتوورەکەی بە چەمكو شێوازی سیستەمەکان بەرفرەوان کردەوە.

کەواتە سیستەمی ئیکۆلۆجیو ژینگەی سروشتی ڕۆڵیان لە ئاراستەکردنو پێشکەشکردنی کەرەستەکانی چارەسەرکردن بۆ گەشەپێدانی کەلتوور بینی.

نوژداری یۆنانی (ابي قراط) لە ئامۆژگارییەکانی خۆیدا دەڵێ: (هەموو نەخۆشێك بە دەرمانی خاکەکەی خۆی تیمار دەکرێت) ئەم گوزارشتە ڕێك

لەگەڵ پێوەندی سیاقە کەلتووریو ئیکۆلۆجیەکانو بنەماکانیاندا دێتەوە، سەبارەت بە ئاراستەکردنی چارەسەرە سروشتییە گونجاوەکان بۆ نەخۆشی، بە شوێن ئەوەشدا ڕەنگە بنەما کەلتوورییەکان بۆ دەرمانی میللی بەم جۆرە:

## دەرمانی میللی لای کۆچەرەکان

ئیبن خەلدون کە کاری پزیشکی لای کۆمەڵەی شوانکارەکان باس دەکات، ئەڵێ، کاری پزیشکی زۆرجار تایبەتە بە چەند کەسێك کە لە پیرو دونیادیدەکانی پێش خۆیانەوە بە میرات بۆیان ماوەتەوە، ئەویش نە ئارەزووی خۆیانی تێدا بووە، نە هیچ ڕێسایەکی سرووشتیان بۆ ئەو مەبەستە پێڕەو کردووە(١٠٧).

هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە دەوارنشینەکان هەوڵ ئەدەن تەندروستی خۆیان بپارێزن نەخۆشی بە خۆراکو دەرمان چاکبکەنەوە، دوای ئەوەی کە بۆیان دەرکەوت هەموو دەردێك دەرمانی هەیە.

هەموو دەردێك دەرمانی لە گژوگیاو مادەی کانزاییو گیانەوەری بۆ دروست دەکرێ، بەڵگەشیان بۆ ئەوە تێکەڵکردنی دەرمانەکانەو کاریگەریی لەسەر

نەخۆشەكەش ئەو نیشانانەیە كە نەخۆش پەسـەندی ئەكات[١٠٨].

هەنـدێ پێیـان وایـە، كۆمەڵگـە شـوانكارەكان لـە ناوچـە عەرەبیەكانـدا، لـەو شـێوازانەی كـە ئاسـتی تەندروسـتی بـەرز دەكاتـەوە بێبەشـن. باوەڕیـان وایـە تـەنها خـودا خـۆی نـەخۆش چـاكدەكاتەوەو خـۆی توانای ژیانو مردنـی هەیـە ئەوانـەی وا بیردەكەنـەوە لە ژینگەیەكی ناتەندروست ئەژین، هەندێ نەخۆشـی سـنوردار بـە هـۆی نـەبوونی گوێڕایـەڵی تەندروسـتییەوە بڵاودەبنـەوە[١٠٩] وەكـو ئاوڵـە (لـە ڕابـردوودا)، نەخۆشـیەكانی پێسـت، سـیل، مـەلاریا ئەبنە هۆی مردن.

مامۆسـتا حامـد الصـراف لـە بـارەی پزیشـكی میللییەوە یان نوژداری بەم جۆرە دەدوێ[١١٠]:

١-داخكـردن: ڕێگەیـەكی ناسـراوە لای كۆچـەرەكان هەنـدێ جـار سوودبەخشـەو هەنـدێ جـاریش ئەگـەر داخكردنەكـە جێـی مەبەسـت نـەپێكێ ئـەوا زیـانی لاوەكی لێدەكەوێتەوە.

٢-شـیرخواردنەوە: بـە تایبـەتی شـیری وشـتر باوەڕیان وایە هـیچ خـواردنو خواردنەوەیـەك ناگاتـە شیری وشتر.

٣-خواردنەوەی شلەمەنی: ئەم کردارە بەوە دەبێ، نەخۆش پێش ئەوەی قاوەڵتی بکات، کوپێك ئاو لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ لای ئێسترەکەی، کلکی ئێسترەکە بکاتە ناو کوپە ئاوەکەوەو لە ئاوەکەی ڕاژەنێ، ئەگەر بەو کوپە ئاوە چاکبووەوە ئەوا وازی لێدێنێ ئەگەرنا کوپی دووەمو سێیەم تاقی دەکاتەوە تا دەگاتە مەبەست.

یەکێ لە وانەی گرنگییان بە نوژداری دەدات ڕووداوێك دەگێڕێتەوە لە دەشتی سەماوە بە چاوی خۆی بینیویەتی، کاتێ هاوڕێیەکی لە کاتی میزکردندا ئازارێکی بەسۆ تووشی دێت، خۆی پیشانی پزیشکەکان دەدات پێیدەڵێن بەردی گورچیلەی هەیەو ئەبێ بە نەشتەرگەری بەردەکەی بۆ دەربێنن. ئەویش لە ترسی نەشتەرگەری گازندەی خۆی دەباتە لای نوژدارێکی کۆچەری کە (صلیبی) پێدەڵێن لە دەشتەکانی تری عێراق (التجاز)ی پێدەڵێن. نوژدارە کۆچەرییەکە پێی وت هەندێك لە میزەکەت پێش قاوەڵتی کردن بۆم بێنە، ڕۆژی دووەم بە هەمان شێوە داوای میزی لێکردو تێی ڕاما، دوای ئەوە بە نەخۆشەکەی وت بەڵێ دەردەکەت چارەسەری لای منە، ڕۆیشت چەند نموونەیەك لە

گـــوڵی دەشـــتەکانی کـــۆکردەوە، لـــە مەنجـــەڵێکی پەسـتاوتو ئـاوی تێکـرد ئـەنجا خسـتیە سـەر ئـاگرو کوڵانی، وای گوشـینو پـاڵاوتنی داوای لـە نەخۆشـەکە کـرد هەنـدێکی لێبخواتـەوە، هـەموو ئێوارەیـەك بـۆ مـاوەی سـێ ڕۆژ تـاکو لـە ڕۆژی سـێیەمدا لەگـەڵ میزکردندا بڕێـك بـەردی ڕەقـی فڕێـدا، دواتـر تـەواو چـاکبووەوە لـەو ئـازارەی کـە ماوەیـەکی زۆر بەدەسـتییەوە ئەیناڵانـد[111]. خەڵکـە کۆچـەرییەکان چارەسەری (تا)یان تای گرانەتا (تیفوئید) بـە دەنکـە ڕووەکـی شمڵی چارەسـەر دەکـەن، دەنکەکـە دەهـاڕنو تێکـەڵی خواردنـەوەی نەخۆشـەکەی دەکـەن تـاکو (تا)کەی دائەبەزێ[112].

لـە دەشـتەکانی لـیبی- تونسـی، کـاتێ گیانـەوەر ژاراوییەکان وەکو مارو دووپشك.. شتی تـر هـەن بـەم جـۆرە چارەسـەری نـەخۆش دەکـەن کـە مـار پێـوەی دەدا.

١-شوێنی پێـوە دراو بـە پـەتێکی بـەهێز دەبەسـتن بۆ ئەوەی ژارەکە ڕۆنەچێتە لەشی نەخۆشەوە.

٢-شـوێنی پێوەدانەکـە شـەق دەکـەن ئـەم جـارە خوێنی سەر برینەکە ئەمژنو ڕۆیەکەنەوە سەر ئەرز ئـەنجا چـەند دانەیـەك سـیر دێـننو لەگـەڵ چـەند

دانەیەك خوێی زبر دەیكوتنو ئەیخەنە سەر برینەكەو ئەیپێچن، گوایە ناهێڵێ ژار بلاوە بكات، ئەم پێچانەوەیە شوێنەوار لەسەر برینەكە جێدێڵێو هەندێ جار پێست دەسووتێنێ.

٣-یەكێ لە بەختگرەوەكان (العزائم) یان تالع ڕوان دەستی ئەخاتە سەر شوێنی پێوەدانەكەو چەند ورتەیەكی لە دەم دێتە دەرەوە كە تایبەتە بەم حالەتی پێوەدانە.

٤-دیارە ئەم دەرمانە سوودبەخشە، بەلام نوژدار هەلئەسێ بەرخێكی نێر سەرئەبڕێ گەدەی بەرخەكە دەردێنێ، شوێنی پێودانەكە ئەخاتە ناوەڕاستی گەدەكە، ئەنجا شوێنە پێوەدراوەكە لەناو كیسەی گەدەكە بە تەواوی دائەپۆشێ، تاكو گەدەكە سارد ئەبێتەوە، هەندێكیان بەمەشەوە ناوەستن بەرخی دووەم سەرئەبڕنو گەدەكە بۆ جاری دووەم برینەكەی پێ ئەپێچنەوە، تا جارێكی تر سارد ئەبێتەوە. ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانە گەدەی بەرخەكە شین هەلئەگەڕێ، هێندەی نەماوە بۆگەن بكات، كرم لێی ئەدات، ئەنجا ئەیخەنە نێو چالێكی قوولەوە تا گیانەوەری تر پێی ژاراوی نەبێت.

شوانكارە كوردەكان بۆ پێكهاتەی دەرمان بنەماو ڕێسایەك پیادە ئەكەن، كەمێك لە پێكهاتەی دەرمانی نوێ جیاوازە، لەوانە بە شێوەی گیراوە یان حەب یان كولاوی، گیراوەی تۆز، مەرهەم، بەستەر، چەوركردن، گۆزو جۆری تری داودەرمان كە لە تاقیكردنەوەی میللی كوردییەوە، بەرهەم هاتووە. بەهەمان شێوە كوردیش كەرەستەی پزیشكی ڕۆحی لە میانەی هەندێ سەیدو شێخەوە، بەكاردەهێنێ. دەرمانگرتنەوە لای هەوارنیشینانی كوێستان لە ڕووەكو گژوگیاو، كانزاكان، فلزو گۆگردو نەوتو خوێ.. تاد دروست دەكرێ، بیری نەوتو كانیو ئاوی كانزاكان بۆ نەخۆشی پێست بەكاردێ، هەر لە كۆنەوە ئەم كانیو سەرچاوانە وەكو چارەسەرێك بەكارهاتووە جگە لە بەكارهێنانی خۆراكو گۆشتو ماست وەكو دەرمان بەكارهاتووە. سەرچاوەی ئاوی كانزاكان لە ناوچە شاخاوییەكاندا بەكارهێنانی زۆر بڵاوە، لە كوردەواریدا دەیان ئێسكگرەوەو نوژداری میللی لە لادێو شارۆچكەكاندا هەن، زۆر بە كارامەیی شكاوی چارەسەر دەكەن، كاتێ لەو كەسانە دەپرسی ئەم پیشەیە لە كێ فێربووە، زۆربەیان ئەڵێن بە میرات بۆیان ماوەتەوە، هەندێكیان دەڵێن

پێشتر لە بواری گرتنەوەی شکاویی ئاژەڵاندا کاریان کردووە.

شاخی بەرانە کێوی بۆ خوێن بەربوون بەکاردەهێنن پێیان وایە، ئەم خوێن بەردانە لە پێویستیەکانی پاراستنی تەندروستییە بە تایبەتی لە وەرزی بەهاردا پێڕەوی دەکەن[١١٤].

چارەسەری میللی لە دەشتەکاندا تەنها لەسەر مرۆڤ پیادە نەکراوە بەڵکو ئاوڵەشیان تیمار کردووە بە تایبەتی وشترو مەڕ بەو سیفەتەی ئەو ئاژەڵانە سەرچاوەی ژیانو چالاکیی ڕۆژانەیانن. هەر بەو جۆرەش گیانەوەرەکانی تریان بەو کەرەستانەی کە لە دەوروبەر بە چنگی دەهێنن چارەسەرکردووە.

تاکو لە فاکتەرە ئیکۆلۆژیو کەلتووریو کۆمەڵایەتییەکان، توخمە چالاکەکان لە چارەسەری دەردو کێشەکانیاندا بەکاربێنن.

٢-دەرمانی میللی لای گوندنشینان (کۆمەڵە کشتوکاڵییەکان) دانیشتوانی گوندەکان شارەزاییەکی تەواویان لە پێشکەشکردنی وەسفەکاندا هەیە بۆ هەموو ئەوانەی خۆیانو ئاژەڵەکانیان، تەنانەت ڕووەكو بەرهەمە کشتوکاڵییەکانیان تووشی نەخۆشی دەبن. بە کردەی پەیوەندی بەهێز لە نێوان

نـوژداری لـە لادێو سـیاقی ئیکۆلـۆجیو کـەلتووری، لـەنێو بیروباوەڕەکانیانـدا هەیـە[١١٥]. نـوژداری وەکـو تـوخمێکی بنـەڕەتی لـە مومارەسـەکردنی هەنـدێ نەریتا وەکو منداڵبوون –بۆ نموونە لە میسـردا- ژنـان هەندێ لە ڕووباری نیل یان ئاوەکەی دەخۆنەوە تـاکو بە ئاسانی مناڵیان ببێ[١١٦].

هـەروەها لـە لادێـدا کـاری پزیشـکی تێکـەڵ بـە نووشتە و جادوو دەکەن، لە میانەی لێکدانەوەی ئـەو نەخۆشـیانەی کـە هۆیەکـەی سـیحر بێـت، بـۆ ئـەوەی هەنـدێ نەخۆشـی لـەژێر کاریگـەریی سـیحرئامێز ڕزگـاری بێـت وا دەخـوازێ لەگەڵیـدا هەنـدێ چارەسـەری سرووشـتی وەکـو مـادەی کـانزاییو ڕووەکـیو گیانـەوەری کـە بـۆ کـاری چارەسـەرو تیمـارکردن بشـێ، بـەکاربهێنرێ. یـان بـۆ پاراسـتنی تەندروسـتی، کـەمێك لـە ئـەزموون، زۆرێـك لـە ئەفسانەو جادوو، کاریگەریی یان ئەکتیف بوونی ئـەو وەسفانە لێکدەداتەوە، بۆ نموونە گەڵای دارخورمـا لـە ئـاودا دەخووسـێنرێ لەگـەڵ گـەڵای گەنمەشـامی بـۆ شـێوانی ڕیخۆڵـەکان، ئـاوی پیـازو خۆڵەمێشـی داری لۆکە بۆ چاو. شیرەی هەندێ دار بۆ بەسـتنی شکاوی،

بەستەری ڕووەکی لیف (قنب) بۆ رۆماتیزمو ئاوساوی[١١٧].

چارەسەرکردن بەم شتانە تێکەڵێکە لە ئەزموونو باوەڕی بنیادنراو لەسەر خەیاڵ.

گوندنشینەکان سوود لە تاقیکردنەوەی گەلانی تر وەردەگرن لە کاتی پێکگەیشتنو هەندێ لە چارەسەرە جیاوازەکانیان لێوەردەگرنو بە تاقیکردنەوە شارەزایی خۆیان کە بۆیان ماوەتەوە بەهێزی دەکەن.

لە نوژداری میللیدا لادێی ڕووسی، کەڵك لە هەندێ دانەوێڵەو پارچەدار وەردەگرن بۆ مەبەستی پزیشکیو تەندروستی جۆراوجۆر. خەڕاتەکان لە تویکڵی داری تەبولا Birch یان داری تر کەڵك وەردەگرنو وەکو پلاستەر بۆ چارەسەری برینەکان بەکاریدەهێنن، مەرهەمو پاودەری پزیشکی لێ دروستدەکەن، چەوری لە خونچەی ئەو دارە بۆ شوشتنی برین بەکاردێنن.

خۆشاوی بەرهەمی ئالۆو یان هەڵووژە بۆ چارەسەری سکچوون Diarrhea بەکاردەهێنن، لە چارەکردنی نەخۆشییەکانی چاوو دەردەشا (داء الملوك Scrofula)دا زۆر چالاکە. هەندێ لە

بـــــەکارهێنراوەکانیان لەگـــــەڵ توێژینـــــەوەکانی دەرمانســازیی نوێــدا کــۆکن[118] زۆر مــادەو شــێوازی پشتپێبەســتراو لــە کۆمەڵگــە کشــتوکاڵییەکاندا وەکــو شێوازی دەرمانی میللیو خۆڵو قوڕ، خۆڵەمێش، کا، کەرەستە ئۆرگانییە جیاوازەکان وەکو میـزی مـرۆڤو میــزی گیانــەوەرو پاشــەڕۆو ئــاژەڵی بــەرزە، ڕۆنــی گیانەوەری بەکاردەبرێ[119].

مـەرج نییـە بـەکارهێنانی ئـەو شـێوازو مادانـەی باسکران لە کۆمەڵگە جیاوازەکانـدا، بـە هـەمان شـێوە بێت هەرچەندە لە هەندێکیانـدا هاوبەشـن، جیـاوازی ڕێژەیی لە باسکردنی هەر مادەیەكو بە گوێرەی هەر نەخۆشـییەك یـان هـەر کۆسـپێکی تەندروسـتی بـە لێکچوون لـە نەخۆشـییەکی دیـاریکراودا سـنووربەند نییــــە، بــــەڵکو هــــەموو شــــێوەکانی دەگرێتــــەوە، نەخۆشـییە دیارەکـان یـان نەخۆشـییە غەیبییـەکان، نیشــــانەی ئــــەم نەخۆشــــییە لەگــــەڵ نیشــــانەی نەخۆشــییەکی تــردا لێکچــووە، بــە پێچەوانەشــەوە نـوژدارە میللییـەکان بـە پێـی نیشانەکان چارەسـەری نەخۆشـی دەکـەن لـەو نەخۆشـییانەش سەراسـییەو برینـەکانو هـەوکردنی چـاو، گورچـیلە، سکچـوونی منــاڵ دواکــەوتنی ســککردن، ڕۆمــاتیزم، کەچــەڵی،

شکاوی ئێسك، گازگرتنی سەگی هار، مارپێوەدانو دووپشك پێوەدان.. تاد.

لە کۆمەڵگە کشتوکاڵییەکانیشدا هەر بەو جۆرە بە ئامرازی تر وەکو داخکردن، کاری نووشتەگەری، هەندێ جار ئەم چارەسەرە ڕووحییە لەگەڵ چارەسەرکردنە سروشتیەکاندا لە لادێ، تێکەڵ دەکرێت.

## پاشبەند:

شتێکی هێندە ئاسان نییە بتوانین بابەتی پزیشکی میللی یان نوژداری لە چەند لاپەڕەیەك، یان کۆرسێکی خوێندندا، سەرتاپاگیر باسبکەین. تۆژینەوەی بەرفرەوان سەبارەت بەم بابەتە، ڕەنێو هاتووەو نامەی ئەکادیمی زۆریش پێشکەش کراوە، بە تایبەتی ئاوڕدانەوەکانی ئەم دواییە بۆ سەرچاوە سروشتیو شێوازو بیروباوەڕەکان لە کایەکانی چارەسەرکردنو تیمارکردندا بواری ڕەخساندووە گرنگی زیاتر بەم بەشە بدرێ، دوای ئەوەی تاقیگەو تۆژینەوەکان، زیانەکانی ئامرازەکانی چارەسەری

كيميـايى، لـە زيانـە لابـەلاو نەخۆشـييە نوێيـەكان پشتڕاست كردەوە، بە ئەنجام گەياند.

ئەگەر هەندێك كەس لەوانەى بڕيارى توندوتيـژ ئەدەن پێيان وايە نوژدارى ڕەهەنـدێكى ئەفسانە يـان جادووگـەرى تـەنها مەبەسـتو ئامانجـەكانى ئاڕاسـتە دەكـات بـە چاوپۆشـى لـە لايەنـە ئەقلانييـەكانى كـە هاوشـانى ڕاسـتييە زانسـتييەكان هەڵوێسـتى هەيـەو داواى دامــاڵينى بــەهاو نيســبييەت دەكــا، داوا دەكــا ديــاردەو هەڵوێســتەكان بــە ســياقە ژينگــەيىو كــە لتــوورىو كۆمەڵايەتييەكانــەوە گــرێ بــدرێ، چــونكە تــۆژەرەوە زانســتييەكانو مرۆناســەكان بــە تايبــەت زيـاتر بابــەتينو پشـتيان بــە ميتـۆدە زانسـتييەكان بەستووە، باوەڕى بەو گشتگيرييە هەيـە كـە مـرۆڤ لـە خاڵێكــدا چــڕدەكاتەوە دەكەوێتــە نــاو ديــاردە گەردوونييەكەوە.

(ئـەكيركخت) يەكێكـە لەوانـەى كـە نـوژدارى يـان پزيشــكى تەقليــدى لــە زۆربــەى مومارەســەكانيدا سەركەوتوو بووە -زۆرجار لـە بەرزييـەوە هەڵدێراوە- بەم جۆرە[١٢٠].

١-ژمارەيــەكى گــەورە لــە فاكتــەرە بابەتييــەكان كاريگەرييان لەسەر كارى پزيشكيى تەقليدى هەبووە،

ئەوەشە وایکردووە زۆر نزیکی دەرمانسازی نوێو پزیشکیی نوێ بێ لە هەندێ لە ئامانجو شێوەکانیدا لەگەڵ جیاوازی لە شێوازەکانیو مەدای سەلامەتیی، وەکو چوونە گەرماو و چارەسەرکردن، داخکردنو گرتنەوەی شکاوی، نەشتەرگەریی کەللەسەر، کوتانی دژی ئاوڵە، چارەسەری مارپێوەدان، کاری دەرمانسازی جۆراوجۆر وەکو: ئەفیون، کینین کە لە چارەسەری مەلاریادا سوودبەخشە، زۆر چەشنە دەرمانی سەرکەوتووی تر کە سروشتو ژینگە پێی بەخشیوین.

بەڵام ئەم چارەسەرانە بە هەستێکی واقعییەوە کاریان نەکردووە بەڵکو بە هەستکردنێکی جادووگەرییەوە پابەند بە نووشتەگەری، بانگو سەڵادان، سرووتو حاڵ لێهاتن بە پێی سیاقە کەلتووری یان ڕێوڕەسمی هەندێ لە کۆمەڵگەکان، کاری لەسەر کراوە.

٢-دابینکردنی چارەسەری دەروونی، لە میانەی هەندێ مومارەسەو سرووتەوە باوەڕو نەریتەکان دایانڕشتووە هەرچەندە بێ مەبەست ئاراستە کراوەو خۆبەخۆ کاریکردووە، بەڵام وەچەکان خۆیان لەگەڵدا گونجاندووەو شوێنەوارێکی زیندووی لە سەرخستنی

چارەسەركردندا لە زۆر حاڵەتی نەخۆشیدا بە تايبەتی لە بواری پەشێوی دەروونیو زەينيدا، بەجێهێشتووە.

٣-فاكتەری پەيوەندييە كەسێتييەكان لە نێوان نۆژدارو پلەی ڕازيبوونی نەخۆش بەو كەرەستانەی كە كەلتووری كۆمەڵگەكەی پەسەندی دەكات، هەروەها ئامادەگيی خودی نەخۆش بەو كارتێكردنە، لە بەرژەوەندی دەستكەوتەكانی چارەسەركردندا، بەرامبەر بە نەخۆشی دەروونی، هاوبەشی بەهێزی يەكتری دەكەن.

(ئەبيقرات) لە بانگەشەكەيدا بۆ چارەسەری نەخۆش، وەكو پێشتر لێی دواين، بەوەی: ئەو دەرمانەی خاكی نەخۆشەكە بەرهەمی دێنێ چارەسەری نەخۆشييەكەی دەكات، چونكە زۆر نزيكە لە سرووشتی جەستەو توخمە سەرهەڵداوە زيندووەكان، مادامەكی زۆرو زەبەندەو خەڵكيش پێی ئاشنايە، چی لە ڕووی هەرزانی بەهاكەيەوە، چی لە ڕووی تواناو هێزييەوە كە خەڵك ئەزانێ توانای چەندە.

ناتوانين لە واقعی ئێستاماندا جياوازی بكەين لە نێوان ئەوەی كۆچەرييە (بدوي) لەگەڵ ئەوەی

دەشتی (گوند)یە لە کاتی گێڕانەوە بۆ ئەسڵی چارەسەرەکان، چونکە هەریەك لەوانە لە دەرەوەی بازنەی ژینگە کەلتوورییەکەی لەگەڵ شوێنەکەیدا، زانیارییەکانی وەرگرتووە. ئەم خۆگونجاندنە لە شارۆچکەکاندا ئاشکرا ترە، چونکە خەڵك خۆی لە دوکانداری پزیشکی میللی، پێویستی بە هەرچیەك بێت داوای دەکات، یان نوژداری خاوەن دوکان خۆی هەندێ جار دەرمانی تەقلیدی لەگەڵ دەرمانی هاوچەرخ تێکەڵ دەکاو دەیداتێ لەو بەرهەمە هاوچەرخانەش کە لە بواری پزیشکیدا بەکاردەبرێن وەکو باندێج (اربطە)، پلاستەر، پاکژکەرەوەو شێوازی هونەری تر لە چارەسەرکردنی برین و شکاوی.. تد. بەکاردێن. دیارە باوەڕی خەڵك بە پزیشکی میللی، بەندە بە باوەڕکردنیان بە پزیشکی ڕەسمیو فەرمانبەرو دوکتۆرەکانەوە، هەروەکو تۆژینەوەکانی د. الخولی و ئەکیرکخت باسی ئەم بابەتەیان کردووە.

هەرچەندە مرۆڤ بە ڕووی دونیای زانستو هونەری پزیشکی نوێدا بکرێتەوە، ئەوەندە لە بیروباوەڕە کۆنو تەقلیدییەکان، کە چەند وەچەیەك پێش ئێستا فاکتەری تووشبوون بە نەخۆشیو

چارەسەری ئەوسای ناسیوە، ئەم گەشتە بە کاری نوژداری میللیدا بەلگەیەکی حاشا هەلنەگرە، بۆ زیاتر چوونە ناو دونیای توژینەوەو لێکۆلینەوە ئەنترۆپۆلۆجییە پزیشکییەکانەوە، بۆ سەرخستنی ئەو مەبەستانەی کە لەم بوارە زانستیەدا هێشتا لە قۆناغی (گاکۆلکێ) کردندایە، لە کۆمەلگەی ئێمەدا لە کاتێکدا گرنگی بەو بوارانەی تر ئەدات کە هیچ پەیوەندییەکی بەو ئامانجانەوە نییە کە ئێمە ئەمانەوێ.

## پەراوێزەکان:

١=د. حنا، نبيل صبحي: الاتجاهات التقليدية والحديثة في الانثروبولوجيا الاجتماعية، دار المعرفة الجامعية الاسكندرية- مصر ١٩٨٥، ص٢٧.

٢-د. حنا، نبيل صبحي: الانثروبولوجيا الطبية وخدمة قضايا الصحة والمرض- مصر.

٣- Caudill, william: Applied Anthropology in .medieín

In)Anthropology Today, (ed), kroeper Al ) .chicago 1953. p 771

4-Reading, Hugo. F: Adictionary of the social sciences london 1978. p 18. 19.

٥-د. حنا، نبيل صبحي: الاتجاهات الحديثة مصدر سابق ص ٢٧.

٦-هەمان سەرچاوە.

٧-د. النوري، قيس: المدخل الى علم الانسان، دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل ١٩٨٢ ص ٣٩٨-.٣٩٩

٨-د. حنا، نبيل صبحي- المصدر السابق ٢٤٣-٢٤٤.

٩-دەمـــــارگیری: پەشـــــێوییەکی وەزیفییـــــە، سەرچاوەکەی دەروونییـە، تووشـی کۆئەنـدامی دەمـار دێـت لـە مرۆڤـدا، زاناکـانی شـیکردنەوەی دەروونـی وەکـــو دیـــاردەی زۆرانبـــازیی نـــاوەوەی مرۆڤـــەکان لێدەکـەن کـە لـە ئـەنجامی داڕووخـانی یـەکێك لـە هانـدەرە غەریزییـە بنەڕەتییەکانـەوە، تـووش دێـت. موسوعة علم النفس، ص ٢٠٧.

١٠-زەینی: Psychosis: پەشێوییەکی زەینییە، هێزە ئەقڵییـەکان لـە مرۆڤـدا دەشـێوێن، بەمـەش تووشـی پەککەوتنێکی سەرتاسەری بەردەوام دەبێت، لە واقع یـــان لـــە شـــتەکانی دەوروبـــەری تێناگـــاو لائـــەدات ڕەفتارەکـانی زۆر ترسـناك دەبـنو کەسـێتی لەدەسـت ئەدات.

١١-سایکۆپاثی یان نەخۆشی کەسێتی Psychopathy نەخۆشـــیەکی دەروونـــی تایبەتـــە، بـــەڵام سرووشـــتی نەخۆشییەکەی دیاریکراو نییە، زۆرجار لە ئـەنجامی کەمتەرخەمی لە دۆزینـەوەی چارەسـەری گونجـاو بـۆ کێشـە دەروونیـەکان، ئەکەوێتـەوە. کـە نـەخۆش بـە دەسـتیەوە گرفتـارە بێئـەوەی تێکچوونێکی دەروونـی ڕوونی لەگەڵدا بێت. هەمان سەرچاوە لا ١٦٠.

١٢-سایکۆماتیك: Psychomatic یان دەروونی-جەستەیی، بە پەیوەندی نێوان دیاردە سایکۆلۆژیو بارە جەستەییەکان ئەوترێ، لە ئەنجامی کارلێکی نێوان دیاردە جەستەییو دەروونیەکانەوە سەرچاوەی گرتووە. هەمان سەرچاوە لا ٣١٧.

١٣-د. ابراهیم عبدالستار- العلاج النفسي الحدیث قوة للانسان- الطبعة الثانیة، القاهرة ١٩٨٣ ص ٤٢-٤٣.

١٤-هەمان سەرچاوە ص ٣٥.

١٥-د. یونس، انتصار، السلوك الانسانی، دار المعارف بمصر- القاهرة ١٩٧٤ ص ٢٦٤-٢٦٥.

١٦-د. اسماعیل قباري محمد، علم الاجتماع الثقافي- مشکلات الشخصیة في البناء الاجتماعي- مصر ١٩٨٢. ص ٥٢٢-٥٢٣.

١٧-د. النوري، قیس، طبیعة المجتمع البشري في ضوء الانثروبولوجیا الاجتماعیة، الجزء الثاني مطبعة الاداب- النجف الاشرف- ١٩٧٢ ص ٢٨٢.

١٨-هەروەکو بەسەر هیندییە سورەکاندا هاتووە لە دەشتە مەزنەکانی ئەمریکا، لە ئەنجامی بێ سەرو شوێن بوونی گامێش گەلی کێوی کە لەسەر دەستی خەڵکی شارەکە (سپی پێستە داگیرکەرەکان)

لەناوبران كاتێ ئەو كەسانە لە حاڵەتی كەمتەرخەمیو ئالوودە بوون بە مەیو كهولو مادە سڕكەرەكان.

د. النوري هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٤٠٢.

١٩-كلايد كلاكهون، الانسان في المرآة ترجمة د. شاكر مصطفى سليم، المكتبة الاهلية بغداد ١٩٦٤ ص ٣٧٧.

٢٠-ئەم نەخۆشییە پێی دەڵێن Amok پەشێوییەكی زەینییە تووشی تاكەكانی هەندێ لە گەلانی سەرەتایی دەبێ، بە تایبەتی لە مەلایۆ و فلیپین بە هۆی كێشەو تەنگژەكانی ژیانەوە، بە خەمۆكیو خۆخواردنەوە دەستپێدەكات بۆ ماوەیەكی درێژخایەن. ئەنجا زیاد دەكاو دەچێتە قۆناغێكی ترسناكترەوە، نەخۆش هەوڵی ئەوە ئەدات هەر كەسێكی تووشبێ بیكوژێ بە بێ جیاوازی، بە هۆی لە دەستدانی تواناكانی كۆئەندامی دەمارەوە، قاموس الانثروبولوجيا ص ٤٨.

٢١-بەم نەخۆشییە دەوترێ ویندیگۆ windigo نەخۆشەكانی تووشی خەوزڕان دەبێ خواردنی پێناخورێ، هەست بە تەنیایی دەكات، هەندێكیان

ئەگەنــە ڕادەی دەستوەشـاندن لـە تاکـەکانی خێـزانو کۆمەڵگەکــەیان، یــان بــە زینــدوویێتی گۆشــتەکەیان دەخوات.

٢٢-هستریای جەمسەری بـاکوری Arectic Hysteria جۆرێکــە لــە ڕەفتــاری هســتیری لــە شــێتی دەچــێ، تاکەکانی خـەڵکی بـاکوری سـیبەریا، بـە هـۆی ساردی کەشو هەواوە تووشی دەبـن، لەگـەڵ ژیـانی سـەختو شەش مانگك لە تاریکیدا بە بـەردەوامی، دانیشـتوانی ناوچـەکە پێیـان وایـە فاکتـەرو بـارودۆخی دیـاریکراو ئەبێتە هۆی ئەم نەخۆشییە..

قاموس الانثروبولوجیا ص ٦٤.

٢٣-حاڵەتــەکانی پەشــێوی ئەقڵییــە هەڵچــوونو ڕەفتـاری سـەیری لێـدەبینی، هـەر لـە حاڵـەتی هـاری سەگ دەچێ.

٢٤-شـــیزوفرینیا Schizophrenia پەشـــێوییەکی ئەقڵییــە بــە لێکداوەشــانو شــیبوونەوەی پرۆســە فکــــریو هەســـــتیاریو ســـــۆزمەندییەکانەوە جیادەکرێتــەوە، کـاتێ تووشــی دەبــەنگیو هەڵچـوون دەبێ.

موسوعة علم النفس ص ٢٣٧.

٢٥-هەڵچوونەکان لە ئەنجامی بەرکەوتنی تاکەکان بە هەلومەرجێك دێت کە هێزە هاندەرەکانی تێربوونی غەریزە شەڕەنگێزی لە ململانێدایە لەگەڵ هێزە بەرهەڵستکارەکانی بەدەستهێنانی ئەو تێربوونە. ڕاڤەکردنی دکتۆر سلیم.

٢٦-د. اسماعیل، قباری محمد، هەمان سەرچاوە ص ٥٢٢-٥٢٣.

٢٧-وشەی ئەپیدمۆلۆجی واتە زانستی دەردەکانی.

٢٨-د. الدباغ فخري، اصول الطب النفسي، الطبعة الثانية، مؤسسة دار الكتب جامعة الموصل ١٩٧٧ ص ٨٣-٨٥.

٢٩-د. سليم شاكر مصطفى، قاموس الانثروبولوجيا جامعة الكويت، ١٩٨١ ص ٧٣٩.

٣٠-هستریا Hysteria، دەمارگیرییەکە توانایەکی توندوتیژ ئەداتە مرۆڤ، بەرەو ئیحاو وەرگەڕانی ئینفعالی دەبا تووشی لاوازی بارگە ویژدانیەکانی دەکا هەروەها ناخی شعورو سۆزداریی لێکهەڵدەوەشێ، ئەم نەخۆشییە لە ئەنجامی زۆرانبازی نێوان زەینی بە ئاگاو حەزە چەپێنراوە ناهەستییەکانەوە، دروست دەبێ، ئەم چەپاندنە ئەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەی ڕازیکردنی حەزە شاراوەکان، نیشانەی

هستیری لەگەڵ ئەوەی تووشی لادان بـووە، لـە هـەمان کاتـدا جووڵـە، دەروون، لـەش تووشـی حاڵـەتی سـەیر دەکات.

موسوعة علم النفس ص ٣٢٦

٣١-د. النـوري، الحضـارة والشخصـية مصـدر سـابق ص ١٨٧-١٩٢.

٣٢-کـاری بـە کۆمـەڵو هـەرەوەزیو خـۆکردە لـەم جۆرە هەڵچوونەدا دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری دەروونـی، چـونکە ئــەم بوارانــە لــە هۆیــەکانی دڵنــەوایيو حەســانەوەی دەروونیــە تــاکو ئــەو چــەپاندنە دەروونییەی یەخـەی گرتـووە، بـۆ تـاوێکیش بێـت لـە کۆڵ بێتەوە.

٣٣-پارانۆیــا Paranoia ئــەم پەشــێوییە بــەوە ئەناسرێتەوە وەهمو وڕێنە سەری لێئەکا لە ئەنجامی چەوسـاندنەوە یـان گەورەبوونـەوە، گەشـە ئـەکا ئـەم وەهــمو خەیاڵانــە مــۆرکێکی نەخۆشــی دەروونــی وەردەگرێ، ئەشێ توشی گرێی چەوسـاندنەوە بـووبێ، یـان خـۆی لا گـەورە بۆتـەوە کـە توانـای گەیشـتن بـە خودای گەورەی هەیە، یان نوێنـەری چارەسـەرکردنی هەموو کێشەکانی جیهانە.

٣٤-خـــەمۆكیو دلگرانـــی Depression مـــرۆڤ لای خۆیـــەوە خـــۆی بـــە كەمتەرخـــەمو نـــەتواناو بـــێ دەســـەڵاتو نائومێـد ئـەزانێ، ئـەم بـارە دەروونییـە هەنـدێ جـار چـالاكیی دەروونـیو جەسـتەیی پـەك دەخات.

٣٤-هەمان سەرچاوە.

٣٥-كاشـــدان، شـــیلدون، علـــم نفـــس الشـــواذ، ط٢ ترجمـة د. احمـد عبـدالعزیز سـلامة، دار الشـروق، القاهرة، ١٩٨٤ ص ١٤٨-١٤٩.

٣٦-هالویل Hallowell, Alfred ئەنثروپۆلۆجییـەكی ئەمەریكییە لـەدایكبوی ١٨٩٢ پسـپۆڕی تۆژینـەوەكانی كـەلتوورو كەســێتییە، هینــدیو ئەمەریكییــەكانو ڕێكخستنی باری كۆمەلایەتیە.

٣٧-كلاكهون، كلاید، الانسان في المرآة ص ٤٩-٥٠.

٣٨-هــــولتكرانس، ایكـــــە، قــــاموس مصـــــطلحات الانثروبولوجیـــا او الفلكلـــور. ترجمـــة د. محمـــد الجـوهري، د. حسـن الشـامي، دار المعـارف مصـر، ١٩٧٢ ص ٢٤٧.

٣٩-د. نور، محمد عبدالمنعم، الخدمة الاجتماعية الطبية والتأهيل، مكتبة القاهرة- القاهرة الحديثة، القاهرة ١٩٧٣ ص ٢٧.

٤٠-د. بدوي، احمد زكي، معجم العلوم الاجتماعية، مكتبة لبنان، بيروت ١٩٧٨ ص ٣٣٨.

٤١-د. حنا نبيل صبحي، الانثروبولوجيا الطبية وخدمة قضايا الصحة والمرض في مصر (في) د. محمد الجوهري (اشراف) الكتاب السنوي لعلم الاجتماع العدد الثالث دار المعارف، القاهرة، ١٩٨٢ ص ٧٨-٧٩.

٤٢-هەمان سەرچاوە، ل ٨٥.

٤٣-فلانز، مانفريد (و) هنريش كيوب، نظرة اجتماعية الى مفاهيم المرضى، ترجمة امين محمود الشريف (في) المجلة الدولية للعلوم الاجتماعية، العدد ١٩٧٨/٣٢ مركز مطبوعات اليونسكو، القاهرة، ص ٢٢.

٤٤- Caudil, William, Applied Anthropology in midicine (in) kroeber Al (ed) chicago, 1953 p, 772, 777.

٤٥-فلانز مانفريد وزميله، مصدر سابق ص ٣٠.

٤٦-لای کۆمەڵناسەکان بە کۆمەڵایەتیبوونی نەخۆشی لێکدەدرێتەوە.

٤٧-د. حنا نبيل صبحى، مصدر سابق ص ٨٢.

٤٨-د. محجـــوب، محمـــد عبـــدة، الـــدلالات الانثروبولوجية لبعض عناصر التراث الشعبي، مجلة المأثورات الشعبية، العدد ١٩٨٧/٦، الدوحة ص ٣٠.

٤٩-ف. م ص ٣٢.

٥٠-د. حنا نبيل صبحي- مصدر سابق ص ٧٧.

٥١-د. ســـليم شـــاكر مصـــطفى، قـــاموس الانثروبولوجيا، جامعة كويت، الكويت ١٩٨١ ص ٦١٧.

٥٢-د. النوري، قيس، الحضارة والشخصية، مصدر سابق ص ١٩٩-٢٠٣.

٥٣-هەڵكشـــان Sublimation زاراوەیەكـــە فرۆیـــد دایهێناوە وەكو بەڵگەیەك لەسەر پرۆسێسی گۆڕینی هێـــزی حـــەزە چـــەپێنراوەكان (المكبوتـــە) و بەتاڵكردنـــەوەی لـــەو بوارانـــەی تـــردا كـــە بـــاری كۆمەڵایەتیو دابونەریتەكان ڕێگەی پێدەدەن، وەكو گۆڕینی حەزی سێكسی بۆ حەزی هونەریو گۆڕینی هێـــزی ڕەمـــەكی (غـــەریزی) لـــە پێنـــاو ئامانجـــە كۆمەڵایەتییەكانـــدا وەكـــو گرنگیـــدان بـــە هونـــەرو ئـــەدەبو مومارەســـەكردنیان، هـــەمان سەرچـــاوە د. بدوی، احمد زكی لا ٤١٢.

٥٤-دامەزراوە كۆمەڵایەتییەكان Social institution زاراوەیەكە، كۆمەڵگە بۆ ڕێكخستنی پەیوەندی نێوان

تاکەکان لە پایە جیاوازەکاندا، بە کاری دێنێ. ئەویش ڕێگەی بیرکردنەوەو کاری پێشووە لە سەرهەڵدانو دروستبوونیەوە لەنێو تاکەکاندا، کە کۆمەڵگە ئەیخولقێنێو تاکەکان پێڕەوی دەکەنو ملکەچینو دەستی پێوە دەگرن چونکە ڕاگری کەلەپوری کۆمەڵایەتییانە، هەر لەو دەروازەیەشەوە سیستەمی هاوسەرێتیو پەروەردەو فێرکردنو یاساو ئابووری.. تاد. ڕێکدەخرێ.

-هەمان سەرچاوە لا ٢٢٠.

٥٥-خودی باڵا یان ویژدان Super- eqo:

لایەنێکی پێکهاتەی کەسێتییە کە لە خود (یان من)ەوە سەرهەڵئەدا، هێزە خولقێنەرە چەپێنراوەکانی تێدا بەرجەستە بووە، تاك لە منداڵییەوە لەگەڵ هەڵگری پێودانگەکان بە تایبەتی دایكو باوکی، دەستەملان بووە، خودی باڵا وەکو ڕەقیبێکی ناخ کاردەکات هەرچۆن پێشتر هەڵگری پێودانگەکان کاریان کردووە.

-هەمان سەرچاوە لا ٤١٥.

٥٦-د حنا نبیل صبحی: الانثروبولوجیا الطبیة وخدمة قضایا الصحة والمرض في مصر (في) د. محمد الجوهري (اشراف) الکتاب السنوي لعلم الاجتماع.

العدد الثالث، دار المعارف، القاهرة، اكتوبر ١٩٨٢ ص ٨٥.

٥٧-ن. م.

٥٨-ئاراستە- ئاراستەکان Attitude: حاڵەتێکە لە ئامادەگی دەروونیو دەمارگیری لە میانەیدا شارەزاییو کارامەیی تاك رێکدەخرێ، کارتێکردنێکی ئاراستەیی یان دینامی هەیە لە بەرپەرچدانەوەی تاك بۆ هەموو هەڵوێستو بابەتەکان، کە ئەم وەڵامدانەوەیە ئەوروژێنن، بڕوانە د. احمد زکی، معجم مصطلحات العلوم الاجتماعیة، مکتبة لبنان، بیروت ١٩٧٧، ص ٣٠.

٥٩- د. حنا، نبیل صبحی- المصدر السابق ص ٧٧.

60-(Candil, William: Applied Anthropology in medicine, Anthropology today, Kroeber. A. L. C.ED) Chicago, 1953 p. 772.

٦١-کلاکهون، کلاید، الانسان في المرآة، ترجمة د. شاکر مصطفی سلیم، بغداد ١٩٦٤ ص ٤٩.

٦٢-البکری، د. حازم، العقاقیر الشعبیة والادویة العطاریة، مجلة التراث الشعبي، بغداد العدد ٩-١٩٨١/١٠ ص ١٠٥.

٦٣-دونیابیني World view: یان نواڕینی سەرتاپاگیری بە جیهاندا World out look

هەرچی سیستەمو کۆمەلگە هەیە دەگرێتە خۆ، وەکو لە دیدی تاكو کۆمەڵەوە، تەماشا دەکرێ ئەویش لە میانەی ڕیتمی بەهاو پراکتیزە کردنی ئەم تیۆرانە لە میانەی ڕەوشتو ئاراستە گونجاوەکانەوە.

بڕوانە: بدوي د. احمد زكي- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٤٦.

٦٤-فلانز، ما. نغريدو زميله: نظرة اجتماعية الى مفاهيم المرض، ترجمة امين محمود الشريف، المجلة الدولية للعلوم الاجتماعية، مركز مطبوعات اليونسكو، االقاهرة، العدد ٣٢/ ١٩٧٨ ص ٢٢.

٦٥-البكري، د. حازم مصدر سابق ص ١٠٥.

٦٦-تەربەنە (التربنة) کردنەوەی کونێکی خڕە لە کەللەسەردا، پاشماوەی ئێسكو پروسك لە تۆژینەوە شوێنەوار ناسییەکانو ئەنترۆپۆلۆجییەکاندا، ئەم پرۆسێسە زیاتر ڕوون دەکاتەوە.

٦٧-غربال- محمد شفيق (اشراف): الموسوعة العربية الميسرة، ط٢، دار الشعب، القاهرة ١٩٧٢ ص ١٤٩-١٥٠.

٦٨- Reading, Hugo. F: Adictionary of the social sciences london, 1978 p. 211.

٦٩-حنا، د. نبيل صبحي: مصدر سابق، ص ٤٦.

٧٠-هەمان سەرچاوە، لا ٤٠.

٧١-سليم، د. شاكر مصطفى: قاموس الانثروبولوجيا، جامعه الكويت، ص ٣٦١-٣٦٢.

٧٢-حنا، د. نبيل صبحي: مصدر سابق ص ٤٠.

73-Candill, william: op. cit. p. 774

74- I bid, p. 773.

٧٥-دكتۆر نبيل صبحى حنا، پێی وایە گۆڕانکارییەکان لە بیروباوەڕی کۆمەڵەوە، ئەوەی پەیوەندی بە سروشتو هۆکانی نەخۆشییەوە هەیە، سەرچاوەی گرتووە.

٧٦-حنا، نبيل صبحى: مصدر سابق ص ٤٧.

٧٧-نفس المصدر ص ٤٧.

78-Candill william: op. cit. pp. 771-772.

٧٩-الخولي، د. حسن: الريف والمدينة في مجتمعات العالم الثالث، دار المعارف، القاهرة ٩٨٢ ص ١٩٥.

٨٠-الراسن: ڕووەکێکی ساڵانەی قەد کورتە، گەڵاکانی وردو بچووکن، ڕەگێکی یاقوتی بۆنخۆشی هەیە، تامی تیژە، لە کۆندا بۆ چارەسەری نەخۆشییە جۆراوجۆرەکان بەکاریان هێناوە.

٨١-البكري، د. حازم: مصدر سابق، ص ١٠٦.

٨٢-شتراوس، كلودليفي: مقالات في الاناسة، اختارها ونقلـها الى العربيــة. د. حســن قبــيس دار التنــوير للطباعة والنشر، بيروت ١٩٨٣ ص ٣٠.

٨٣-الجـوهري، د. محمـد محمـود: مظـاهر التغـيير مجتمع غرب اسوان، مطبعـة جامعـة القـاهرة ١٩٧٥ ص ١٥٤.

٨٤-نفس المصدر. ص ١٥٥.

٨٥-الزنجـور: ماســی درێــژی شــێوە لاکــێشو زار گەورەیە.

٨٦-ســپیلك (البیوضــة) ماســییەکە لــە ڕووبــاردا دەژی.

٨٧-شتراوس، كلود ليفی: مصدر سابق ص ٢١.

نموونــەی زۆرو بــەرفرەوان لــەم بارەیــەوە هەیــە، تەنها بۆ بەڵگە ئەوەندەمان لێیهەڵبژارد.

٨٨-ئەم چەمکە پێناسـەیەکی خـوازراوە لـە چـەند بڕگەیەکدایە. چونکە یەکەیـەکی کـۆك بـۆ پێناسـەی پزیشکی میللی نییە.

٨٩-الخولی، د. حسن/ مصدر سابق، ص ١٥٩.

٩٠-نفس المصدر، ص ١٦٣.

٩١-الجوهري، د. محمد محمود، مصدر سابق، ص ١٥٥.

٩٢-نفس المصدر: ص ١٥٦-١٥٧.

٩٣-سليم، د. شاكر مصطفى: مصدر سابق ص ٦١٨.

٩٤-العاني، عبدالعزيز: المدينة المزقة- دراسة ميدانية فولكلورية لمدينة عنة- دائرة الشؤون الثقافية والنشر، بغداد ١٩٨٥ ص ٢٣٨.

٩٥-سليم، د. شاكر مصطفى: مصدر سابق ص ٥٩٧.

٩٦-(نیشان) لاي ساداتەکانی عێراق و هەندێ کۆمەڵگەی عەرەبی ئیسلامی، بە پێی مەزهەبی شیعە، هێزو توانای (مانا)یە، یان شێوەیەك لە شێوەکانیەتی.

٩٧-النوري: د. قيس: الأساطير وعلم الاجناس، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل ١٩٨١ ص ١٦٣.

٩٨-بدوي، د. أحمد زكي، مصدر سابق ص ١٥٩.

٩٩-الحجية، عزيز جاسم، بغداديات، الجزء الخامس، دار الرشيد، ١٩٨١ ص ٢٠٧.

١٠٠-بدوي، احمد زكي، مصدر سابق، ص ٥٧.

١٠١-سليم، د. شاكر مصطفى: مصدر سابق ص ٩١٤.

١٠٢-غربال، محمد شفيق: مصدر سابق، ص ٥٣٤.

١٠٣-العاني، عبدالعزيز: مصدر سابق، ص ٣٥٤-٣٥٥.

١٠٤-محجوب، د. محمد عبدة: الدلالات الانثروبولوجية لبعض عناصر التراث الشعبي، مجلة المأثورات الشعبية، الدوحة، العدد السادس ١٩٨٧ ص ٢٧-٢٨.

١٠٥-سليم، د. شاكر مصطفى: مصدر سابق ص ٤٧٠.

١٠٦-الجوهري د. محمد محمود، مصدر سابق ص ٥٦=٥٧.

١٠٧-ابن خلدون، عبدالرحمن: مقدمة ابن خلدون، دار العلم، بيروت، د. ت ص ٣٩١.

١٠٨-المصدر نفسه، ص ٣٩٠.

١٠٩-زیادە ڕۆییمان کردووە ئەگەر کۆمەڵگە کۆچەرو شوانکارەکان لە تواناکانی چارەسەرییان، دامالّین، چونکە ئەم کۆمەڵانە کەرەستەی خۆیان هەیە، بەڵام تۆژەرەوەو بەهرەمەندان، ئەوان بە دوای بارودۆخی تەندروستیی کۆمەڵگەکانماندا وێڵن‌و دەیانەوێ بەو پێوەرەی خۆیان بەراوردکاری تواناو کەرەستەکان بکەن، بێ ئەوەی ڕەچاوی سیاقە کەلتووری‌و کۆمەڵایەتی‌و ئیکۆلۆجییەکە بکەن.

١١٠-انظر، البرازي، د. نوري خليل: البداوة والاستقرار في العراق، معهد البحوث والدراسات العربية، جامعة الدول العربية- ١٩٦٩، ص ١٧١-١٧٢.

١١١-هـدو، حميـد مجيـد، لمحـات عـابرة في الطـب الشـعبي العربـي والتـداوي بالاعشـاب، مجلـة الـتراث الشعبي، بغداد- العدد ١٩٨١/١٢، ص ١٥٠-١٥١.

١١٢-المرزوقي، محمد: مـع البـدو في حلـهم ترحـالهم، الدار العربية للكتاب، ليبيا- تونس ١٩٨٤ ص ٢١٦.

١١٣-المصدر نفسه، ص ٢١٩-٢٢١.

١١٤-ينظـر للتفصـيل: بـاجلان ابـراهيم، الطـب الشعبي الكردي، جريدة العـراق، بغداديـة الاعـداد ٣٧١٣ و ٣٧١٩ في ٥ نيسـان ١٩٨٨ و ١٢ نيسـان ١٩٨٨. وايضـاً التداوي بالاعشاب والنباتـات الطبيـة، العـدد ٣٦٦٣ في ٧ شباط ١٩٨٨.

١١٥-الجوهري، د. محمـد محمـود: مصـدر سـابق ص ١٥٣.

١١٦-عيروط، الاب د. هنري حبيب: الفلاحون، ط ٨ ترجمـة محـي الـدين اللبـان وزميلـه، مؤسسـة الحلـبي وشركاه للنشر والتوزيع- القاهرة ١٩٦٨ ص ٢٤٩.

١١٧-المصدر نفسه، ص ٢٥١.

١١٨-ينظر:

Toren, M, D, The use of wild, Growing plants in the Russian folk mendicine P. P. 508-512.

١١٩-الخولي، د. حسن: مصدر سابق، ص ٤١٣.

١٢٠-Candill, William, op. cit, P.P 773-774.

سەرچاوە: في الانثروبولوجيا الطبية، الدكتور مجيد حميد عارف، الموسوعة الثقافية تصدر عن دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد/ ٢٠٠٤

نووسەر لە چەند دێڕێکدا:

⋆ساڵی ١٩٤٦ لە قەرەداغ/ سلێمانی لە دایك بووە.

⋆بەکالۆریۆسی لە مێژوو لە کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی بەغدا تەواوکردووە.

⋆دکتۆرای لە ئەتنۆگرافیا لە ئامۆژگاری ئەتنۆگرافی سەر بە ئەکادیمیای زانستیی سۆڤیەتی مۆسکۆ ١٩٧٧ هێناوە.

⋆لە کۆلێجی ئاداب لە زانکۆی سلێمانی مامۆستای کۆمەڵناسی بووە، هەروەها لە کۆلێجی ئادابی زانکۆی بەغداش مامۆستای کۆمەڵناسیو زانستە دەروونییەکان بووە.

⋆چەند تۆژینەوەیەکی لەم بوارەدا بە زمانەکانی عەرەبیو کوردیو ئینگلیزی، بڵاوکردۆتەوە.